بەرانبەر بە نیوەی قەران. برابر ده شاهی نصف قران.

**پەناگرتن**: *panâgerten* خۆ شاردنەوە. پناه گرفتن.

**پەنام**: *panâm* قوبکە بەستنی برین. برآمدگی، آماس.

**پەنام**: *panâm* نەهێنی، پەنامەکی. پنهان، نهان، پوشیده، نهفته.

**پەنامەکی**: *panâmaki* نەهێنی، لەخەفا. مخفیانه، در اخفا کاری را انجام دادن، پنهانی، سری.

**پەنجا**: *panjâ* پەنجا. عدد پنجاه ۵۰.

**پەنجدەری**: *panjdari* ژوورێك كه پێنج دەلاقەی هەبێ، نێوی چایخانەیەکی قەدیمه لە شاری سنە. پنج دری، پنج پنجره ای، نام قهوه خانه ای قدیمی واقع در خیابان ناصرخسرو کنونی شهر سنندج.

**پەنجۆڵە**: *panjōĭa* پەنجە. پنجول، پنجه.

**پەنجە**: *panja* پەنجۆڵ، پەنجۆڵە. پنجه، تعداد انگشتان دست.

**پەنجە کێشی**: *panjakēši* چەشنی نانی تەنووری وەکو کولێرە. پنجەکشی، نوعی نان گرده، نانی که با ناخن روی آن حك کرده باشند، نان ناخنی.

**پەنجە مەریەم**: *panjamaryam* نێوی گیایەکە وەکو پەنجوڵ وایە. گیاه چنگ مریم که به شکل پنجه دست است.

**پەنجەوانە**: *panjawâna* خشڵی پەنجۆڵەی منداڵ. پنجگانه، زیور انگشتان دست زنان و کودکان.

**پەن دان**: *pandân* کردەوەی خراپ لێ قەومان. عمل خلاف کردن.

**پەن دریاگ**: *panderyâg* پەن دراو. عمل بد دربارەی او انجام گرفته.

**پەنگ**: *pang* پەم. حالتی از جمع شدن مقداری زیاد و خارج از اندازه و ظرفیت آب یا دود و بخار.

**پەن لێدریاگ**: *panlēderyâg* پەن لێدراو. فعل بد در مورد او روی داده شده.

**پەنەمیاگ**: *panamyâg* پەنەماو، هەڵماسراو. ورم کرده شده، آماسیده.

**پەنەمیان**: *panamyân* پەنەمان، هەڵماسین. ورم کردن، آماسیدن.

**پەنەمیگ**: *panamig* پەنەماو، هەڵماسراو. ورم کرده، آماسیده.

**پەنەمین**: *panmin* پەنەمان، هەڵماسین. ورم کردن، آماسیدن.

**پەنە نامەت**: *pananâmat* بەد کردار. بد کاره، بد فعل.

**پەنێر**: *panēr* پەنیر. پنیر، از محصولات لبنی که از شیر نیمه گرم و مایه مخصوص به دست می‌آید.

**پەوچێ**: *pawčē* بۆ ئەوەی، لە بەر ئەوەی. برای اینکه.

**پەوکێ**: *pawkē* بۆ ئەوەی، وەکو (پەوکێ چووم). برای اینکه، مانند (برای اینکه رفتم).

**پەیا**: *payâ* ئاشکرا، وەکو (کتێوەکە پەیا بوو). پیدا، آشکار، عیان، مانند(کتاب پیدا شد).

**پەیاپـــەی**: *payâpay* پـــەی دەرپـــەی، شوێن لە سەر شوێن. پیاپی، پی در پی.

**پـەیا کـردن**: *payâkerden* دۆزینـەوە، وەدەسـت هـێنان لـە ناکـاو. پیـدا کـردن، یافتن.

**پەیجۆر**: *payjōr* پاپەی، لەشوێـن چـوون و سوور بوون لە سەر کارێ. پـی گـیر، در پی.

**پەیغام**: *payγâm* پەیام. پیام، سفارش از راه دور.

**پەیغەمـــــەر**: *payγamar* نوێـــــنەری خـودای مـەزن، پـەیام هـێنەر. پیغمبـــر، پیامبر، پیام آور، کسی کـه پیـامی را از طرف کسی به کـس دیگـر برسـاند یـا بیاورد.

**پەیکوڵ**: *paykoĭ* دڕکی سێ گوش. خـار مغیلان.

**پەین**: *payen* گووی ماڵات. پهن، فـضله حیوانات اهلی.

**پەینجە**: *payenja* پەیژە. نردبام.

**پـــەیوەس**: *paywas* لکــاو، گرێبەســت. پیوست، همراه.

**پەیوەن**: *paywan* لکاوە، پـێکەوە، بەنـد کراو. پیوند، اتصال.

**پیا**: *payâ* پـێدا، وەکـو (پیـا چـوومەوە). روی آن، توی آن.

**پیابردن**: *peyâberden* تێنان. فروبردن، فروکردن.

**پیـا پـــەڕیگ**: *peyâpaŕig* پیـا پــەڕیو. ورپریده، نفرینی است مانند بلاگرفته.

**پیاچزانن**: *peyâčezânen* داخنان. داغ نهادن.

**پیاچـــووگ**: *peyâčug* پیـــا رویـــشتوو، پیاچوو. دوبـاره از آن رفتـه، بـا آن رفتـه، ور رفته.

**پیاچـــوون**: *peyâčun* ســــەر لــــەنوێ چوونەوە. دوباره کاری.

**پیاچــــوونەوە**: *peyâčunawa* پیـــــا رۆیشتنەوە. دوباره کاری.

**پیاچـــــەقانن**: *peyâčaqâen* تــــێ چـەقاندن. فرونهـادن، فـرو کـردن، فـرو بردن جسم تیز در زمینه نرم.

**پیاز**: *piyâz* پیواز. پیاز، گیاهی پایا کــه ریشه و برگهای آن مصرف خوراکی دارد.

**پیـاز پاکـەر**: *piyâzpâkar* ئـەوەی کـە پیـواز پـاك دەکـا. پیـاز پـاك کـن، کنایـه از بیکاره.

**پیـــازگ**: *peyâzeg* پیراســـکە. کیـــسەای کوچك حاوی اسباب و وسایل کار که زنـان با خود حمل می‌کردند.

**پیـاگ**: *piyâg* پیـاو، مـێرد. مـرد، جـنس مخالف زن. پیاگانە: *piyâgâna* پیاوانــه. مردانــه، منــسوب مــرد، اخـلاق مردانه.

**پیاگ خراو**: *piyâgxerâw* پیاو خراپ، تاوانبار. نامرد، خطا کار، مرد بد فعل.

**پیاگەتی**: *piyâgati* پیـاوەتی. مردانگـی، اخلاق مردانه.

**پیاگەیانــــدن**: *peyâgayânden* بـــە ئەندازە گەیاندن. بە او رسانیدن، بـە حـد دلخواه رسانیدن.

**پیاڵــە**: *piyâĭa* جــامی تایبــەت بــۆ خواردنەوە. پیاله، فنجان، جام، ساغر.

**پیامـــاڵین**: *peyâmâĭin* پیاســـاوین، ماڵاندن. مالاندن، مالانیدن.

**پیاهەڵــچەقین**: *peyâhaĭčaqin* پیـــا هەڵ چەقاندن. به آن کوبانیده شده.

**پیاهەڵدان**: *peyâhaĭdân* تاریف کردن. تعریف و توصیف کردن، تمجید کردن.

**پیاهـــــــەڵڕوانین**: *peyâhaĭŕwânin* پیـاڕوانین بـە گـشتی. نگـاه کـردن سـر تـا سری.

**پیاهەڵـــــــسپاردن**: *peyâhaĭsepârden* پیاهەڵسپاردن. به آن تکیه دادن.

**پیاهـــــــەڵکاڵیان**: *peyâhaĭkâĭyân* پیاهەڵکاڵین، بەگژا چوون. پرخـاش، او را از رو بردن.

**پیـت**: *pit* بەرەکـەت، درێـژە، وەکـو (ئـەم کارە هەرپیت ئاتەوە). برکت، ادامه، درازا، مانند (این کار ادامه دارد).

**پێت**: *pēt* بە تۆ. به تو، همراه تو.

**پـێتان**: *pētân* بـە ئـێوە، وەکـو (پـێتان ئەێژم). به شما، مانند (به شما میگویم).

**پێتان**: *pētân* لەگەڵتان، وەکو (قەڵەم ها پێتان). همراه شما، مانند (مداد همراهتان است).

**پێچانەوە**: *pēčânawa* پێچاندنەوە. دوباره بستن.

**پێچاوپـــــێچ**: *pēčâwpēč* بـــــاداروی تێکەڵاو. پیچ در پیچ.

**پێـچك**: *pēčak* چەشنـێك گیـای کـێوی وەکو سیر. گیاهی کوهی شبیه به سیر.

پێـــچکردنەوە: *pēčkerdenawa* بادانەوە لە ڕیگا. برگــشتن، مــسیرعوض کردن، پیچ کردن.

**پێچ لێدان**: *pēčlēdân* پێچ کردنەوە. پیچ دادن، کنایه از کسی که خود را به آن راه میزند.

**پێـــچەوانە**: *pēčawâna* پێـــچەوانە. برعکس، وارونه، پشت و رو.

**پـــێچ و پـــەنا**: *pēčupanâ* جـــێگای نەهێنی. جای مخفی و پنهانی، کوچه پس کوچه.

**پێچوون**: *pēčun* رابـواردن. با آن رفتن، گذر وقت.

**پێـــچیاگ**: *pēčyâg* پێـــچراو، پێـــچاو. پیچانده شده.

**پـــێخەف**: *pēxaf* ئـــامرازی خـــەوتن. وسیلەی خواب.

**پـێداگ**: *pēdâg* پـێداو، پـێدراو، وەکـو (خوا پێداگ). داده شـده، مانـنـد (خـدا بـه او داده).

**پێدان**: *pēdân* پێدان. به او دادن.

**پێدریاگ**: *pēderyâg* پێدراو. به او داده شده.

**پێرارەکە**: *pērâraka* دوو ساڵ پێش. پیرار سال، دو سال پیش.

**پێراسکە**: *pērâska* پیازرگ، پیازگ. بقچه کوچك وسایل زنان.

**پیران**: *pirân* غەش لە کەنین وگریندا. بی حال شدن، غش در خنده و گریه.

**پیربوون**: *pirbun* بـە سالا چوون. پیـر شدن، پا به سن گذاشتن.

**پیرکریـاگ**: *pirkeryâg* پیرکـراو. پیـر شده، پا به سن گذاشته شده.

**پیرۆز**: *pirōz* سەرکەوتوو. پیروز، موفق، فرخنده، مبارك.

**پـیرۆزە**: *pirōza* کانزایـەکی شـینە. فـیروزه، یکـی از سـنگهای قـیمتی، نـامی زنانه.

**پیرۆزەیی**: *pirōzai(i)* بـەڕنگی پـیرۆزە. فیروزەای منسوب به پیرۆزه.

**پـیرۆك**: *pirōk* چـرچ بـوونی پێـستی دەسـت یـان پـێ بـەهۆی ئـاوەوە. چـروک برداشتن پوست بر اثر آب و استحمام.

**پیروومـەر**: *pirumar* نـێوی مزگـەوت و زیارەتێکە لە شاری سنە. پیر عمر، امـام زاده ای در سنندج که در حیـاط وسـیع آن آرامگاه اعیان و اشراف سـابق شـهر سنندج قرار دارد.

**پیرە پەنك**: *pirapanak* بـە سالاچووی هەرزە و ئاخر شەڕ. پیر بـد عاقبـت و بـد رفتار.

**پـیرە پیـاگ**: *pirapiyâg* پـیرە پیـاو، پیـاوی بـە سالاچوو. پیرمـرد، مـرد پـیر و مسن.

**پیرە ژن**: *piražen* ژنی بەتەمن. پیرزن، زن پیر و مسن.

**پـێرە شـەو**: *pērašaw* پـێرە شـەو. دو شب پیش.

**پێرەکە**: *pēraka* دوو ڕۆژ پێش. دو روز پیش.

**پیری**: *piri* تەمـەن درێـژی. پـیری، سـن و سال زیاد.

**پـیری**: *piri* ڕووبـەڕوو بوونـەوە، پیـشواز. استقبال، پیشواز.

**پیز**: *piz* پیز، توان. یارا، توان، حوصـله، طاقت.

**پـــێزانین**: *pēzânin* پـــێزانین. قدردانستن، قدرشناسی، اطلاع داشتن.

**پیزۆکە**: *pizōka* پێزۆڵە. جوش چرکی.

**پیژامە**: *pižâma* شۆالی ژێر تایبـەت بـە پیاوان. زیر شلواری، شلوار راحت، پیژامه.

**پێژیاگ**: *pēžyâg* پێژراو.آمـاده شـده، ساخته شده، پهن شده، مثلاً آماده کردن نان برای پخت در تنور.

**پێس**: *pēs* پێست. پوست، جلد، غـلاف، قشر، آنچـه کـه روی انـدام انـسان یـا جانوران را پوشانده و اعمال آن احساس حرارت و برودت درد و لمس، محافظت از بدن بـرای جلـوگیری از ورود میکـروب است.

**پـێش خەومـەت**: *pēšxawmat* پـێش خزمەت. پیشخدمت، نوکر، خدمتگزار.

**پێشکەشی**: *pēškaši* ئەوەی کە بە دیاری دەدرێ. هدیه، کادو، پیشکشی.

**پێشکەفت**: *pēškaft* پیشکەوت، گەشە. ترقی، پیشرفت.

**پێـشکەفتگ**: *pēškafteg* پێـشکەوتوو. مترَقی.

**پێـشکەفتن**: *pēškaften* پێـشکەوتن. پیشرفت کردن، ترقی کردن.

**پێش گیریاگ**: *pēšgiryâg* پـیش گـیراو. مسدود شده، سد شده.
**پێـــــشواز**: *pēšwâz* بەپیرەوچـــــوون. استقبال، پیشواز.
**پیـشۆك**: *pišōk* بـنی گیایـەکی زۆر سـپی ڕەنگـە. زراونـد، از گیاهـان ریـشەدار کـە غدەای سفید رنگ دارد.
**پێشە**: *pēša* ئیسقان. استخوان.
**پێشە**: *pēša* ناوکە. مغز میوەجات مانند هسته زرد آلو یا هلو.
**پێـــشە خوەشـــە**: *pēšaxwaša* ناوکـــە خۆشە. هسته قابل خوردن میوه.
**پێـشە شـلانە**: *pēšašelâna* ناوکـەی شێلانە. هستەی زرد آلو.
**پێـشە و پـلان**: *pēšawpeĭân* ئیـسقان وردودروشت. استخوان های به جا مانده.
**پێـشەی خورمـا**: *pēšayxormâ* ناوکـە خورما. هستەی خرما.
**پیفك**: *pifek* دەسـتە گـیرەی تایبـەت، بـە سکڵ ئاور. گیرەای چوبی آتش.
**پیفڵـــە**: *pifĭa* هـــەڵاتوو. پـُــف کـــردە، ورآمدە.
**پێکان**: *pēkân* پـێکان. مورد هدف قـرار دادن، اصابت.
**پـێکیا**: *pēkeyâ* پـێکرا. زده شـد، مـورد هدف قرار گرفت.
**پێکیاگ**: *pēkeyâg* پێکاو، پێکراو، گلاو. مورد هدف قرار گرفته شده.
**پــێ گەیانــدن**: *pēgayânden* بەخـێو کـردن، پـەروەردە کـردن، ڕەسـاندن. بـە او رساندن، به حد دلخواه رسانیدن.
**پـێگەیانن**: *pēgayânen* پـێ گەیانـدن. به هم رسانیدن، به حد رشد رسانیدن.
**پـــێگەیانن**: *pēgayânen* پـــێگەیاندن، بەخێو کردن. پرورانیدن، به او رسانیدن.
**پێگەیگ**: *pēgaig* پێگەیگ، پێگەیشتوو، گەشەکردوو. رسیده، به حد رشد رسیده.
**پێگەین**: *pēgain* پێگەیشتن. رسیدن.
**پێ گەین**: *pēgain* گەیشتنی دوو کـەس بە یەك. به هم رسیدن، ملاقات کردن، به حد رشد رسیدن.
**پـێم**: *pēm* بـە مـن، بـە ئـەو مـن، وەکـو (پـێم وت). بـە او، مـن، ماننـد (مـن بـە او گفتم).
**پـــێمان**: *pēmân* بـــە ئـــێمە، وەکـــو (دای پێمان). به ما، مانند (به ما داد).
**پێمی**: *pēmi* به مـنی، وەکو (ئـەو پـێمی وت). به من او، مانند (او به من گفت).
**پێنـازین**: *pēnâzin* شـانازی کـردن بـە شتێ یان کەسێ. به آن افتخار کردن.
**پـێ ناسـاندن**: *pēnâsânden* بـە ئـەو ناساندن. به او معرفی کردن.
**پـێ ناسـین**: *pēnâsin* ناسـاندن. معـرفی کردن.
**پینەچی**: *pinači* پـێنە دۆز. پینـە دوز، پاره دوز، تعمیرکار کفش.
**پینەچیگەری**: *pinačigari* پـێنەدوزی. پینـەدوزی، شـغل تعمـیر کـار کفش.
**پینەوپـــــەڕۆ**: *pinawparō* پینـــــە و پـــەڕۆکردن ئاماژەیـــەکی کنایەیـــە بـــۆ

راستکردنەوەی شتێك. تعمیر لباس، کنایـه از دوخت و دوز و سنبل کردن.

**پێــوانن**: *pēwânen* ئەنـــدازە گـــرتن. اندازە گرفتن، طی کردن.

**پێهاتن**: *pēhâten* بەخت هـێنان. شـگون داشتن.

**پیــەوبووگ**: *peyawbug* تێسمـــێرپاگ. قوی هیکل، درشت اندام.

**پیــەوبوون**: *peyawbun* پـــێوە بـــوون، گیروده بوون. گرفتار شدن.

**پیەوچـــوون**: *peyawčun* پـــێوەچوون، پـــێوە ڕۆیـــشتن. همـــراه آن رفـــتن، وســـیله رفتن.

**پیەودان**: *peyawdân* پێوەدان، لێکنان. نیش زدن، بستن.

**پیەونازین**: *peyawnâzin* پـێوە نـازین، بـــە شـــتێ شـــانازیکردن. بـــە آن نازیـــدن، فخرکردن.

**پیـــەوهاتن**: *peyawhâten* پـــێوەهاتن، هێنانی بەخت. شانس آوردن.

# ت

**تـا**: *tâ* لنگـه، وەکـو (تـا هـەنگوور). لنگـه، بار، مانند (لنگه انگور).

**تا**: *tâ* تا، دا، لـف. حرف فاصـلـه زمـانی و مکانی، حتّی، همتا.

**تا**: *tâ* تاکو، تـا، وەکـو (تـا هـاتم بـێم). تـا، مانند (تا آمدم که بیایم یا تا خواستم که بیایم).

**تا**: *tâ* تا، لۆ. همتا، جفت.

**تا**: *tâ* ها، پیتی مەرج. حرف شرط، حتی، تا هر وقت.

**تـا**: *tâ* چـەماو، وەکـو (تـای کـرد). خـم، دولا، مانند (دولا یا خم کرد).

**تابوون**: *tâbun* چەمانەوە. خم شدن، تـا شدن.

**تابەنی**: *tâbani* پـەی چـنین. تـه بنـدی، شیرازه بندی.

**تاپـاز**: *tâpâz* تەمبـەڵ و زل. کنایـــه از آدم درشت هیکل و بی خاصیت.

**تاپڕ**: *tâpeŕ* جۆرێ تفەنگ. تەپڕ، نوعی تفنگ شکاری.

**تـاتکێ**: *tâtekē* تاسـکێ، (ملـه تـاتکێ). حرکت سروگردن از سر کنجکاوی.

**تاتـــه**: *tâta* بابـــه، بـــاوك، ئـــەم وشـــه هەروامییه. مأخوذ از گویش اورامـی بـه معنای پدر.

**تاته شۆر**: *tâtašōr* کەتی مـەیت شـستن. تختـه شـور، جـایی کـه مـرده را روی آن غسل دهند.

**تاجێ**: *tâjē* نێوێك بـۆ ژنـان. نـام زنانـه منسوب به تاج کلاه مخصوص پادشاهان.

**تـار**: *târ* هـا، ئامیرێـکی مۆسـیقایی. تـار، یکی از آلات موسیقی سنتی.

**تـاران**: *târân* نـێوی پاتـەختی ئـێران. تهران، پایتخت کشور ایران.

**تـــارانن**: *târânen* تارانـــدن، راونـــان. تاراندن، متفرق کردن.

**تـارژەن**: *târžan* ژەنیـاری تـار. تـار زن، تارنواز، نوازندەی تار.

**تارژەنی**: *târžani* کاری تـار ژەنـدن. تـار زدن، تار زنی، تار نواختن.

**تارنیـــان**: *târniyân* راونیـــان. فـــراری دادن، تاراندن.

**تارومـــــار**: *târumâr* تێکـــــشکاندن و هـەڵاتن. تارومـار، از هـم پاشـیده، شکـست لشکریان در حال فرار.

**تارەت**: *târat* تەهارەت. طهارت.

**تارەمـــــایی**: *târamâi(i)* تارمـــــایی، ڕەشـایی. شـبح، حـالتی بـین تـاریکی و روشنی.

**تاریاگ**: *târyâg* راونـراو، تاراو. فراری داده شده.

**تـــاریف**: *târif* تـــەعریف. تعریـــــف، توصیف، تمجید.

**تاریك**: *târik* ها، دژی رووناك. تاریك.

**تاریکـــان**: *târikân* کـــاتی تـــاریکی، تاریکایی. هنگام غروب، غروب گاهان.

**تاریـــــك داهــــــاتن**: *târikdâhâten* تاریکبوونی هەوا. تاریك شدن هوا.

**تاریکولـــێڵ**: *târikulēĭ* هـــا، تاریـــك و روشن. گرگ و میش هوا.

**تاریکەشەو**: *târikašaw* شـەوی تاریـك. شب تاریك.

**تازە**: *tâza* ها، نویێ. تازە، نو.

**تازەبـــاو**: *tâzabâw* بابـــەتی رۆژ، تـــازە داهاتوو. مدرن، مـدل تـازە، تـازە بـە بـازار آمده.

**تـازەبوون**: *tâzabun* تـازەگی، نوێـبوون. نو نوار شدن، تازە شدن.

تازەبوونـــەوە: *tâzabunawa* هـــا، ســـەر لەنوێ تازە بوون. تازە شدن، نو شدن.

**تـــازە بـــە تـــازە**: *tâzabatâza* نـــوێ بـــە نوێ. تازە به تازە، نو به نو.

**تازە بەر**: *tâzabar* ها، نەوبەری مێوە. نوبر، اولین ثمر درخت.

**تازە پیاکەفتگ**: *tâzapeyâkafteg* تازە پیاکـەوتوو، کەسـێك کـە بـە تـازەی بووتـە خـاون سـامان. نوکیسه، کنایه از کسی که پس از یک دوران فقـر صـاحب ثـروت شده.

**تـــازە داهـــاتگ**: *tâzadâhâteg* تـــازە داهاتوو، تازە باو. تازە آمد، تازە مُد شده.

**تازە زاوا**: *tâzazâwâ* ها، پیاوێ کە تـازە بووکی هێناوە. تازە داماد.

**تازەکار**: *tâzakâr* نوێـکار. ناشـی، تـازە کار.

تازەکردنـــەوە: *tâzakerdenawa* نوێکردنەوە. تازە کردن، نو کردن.

**تـازەگی**: *tâzagi* بـەم زووانـە. تـازگی، جدیداً.

**تازەیی**: *tâzai(i)* شتی تازە، بەم زووانە. تازگی، جدیداً، اخیراً.

**تازیم**: *tâzim* کورِنش. تعظیم، کُرنش.

**تاس**: *tâs* ورِ، گێژ. گیج.

**تاس**: *tâs* سەری بـێ مـوو. طاس، ســـربی مو.

**تاس**: *tâs* مۆرەی نەرد. مهره تخته نرد.

**تاسـانن**: *tâsânen* تاسـاندن، گـێژکردن، تاسران. گیج کردن.

**تـــاس کـــەواو**: *tâskawâw* جـــۆرێ خواردن. غذای تاس کباب.

**تاســـۆخ**: *tâsōx* تاســـە، ئـــارەزوو. آرزو، اشتیاق.

**تاسە**: *tâsa* ئارەزوو. آرزو، اشتیاق.

**تاسـە بـار**: *tâsabâr* هـا، ئارەزوومەنـد، ئاوات لەدڵ. آرزومند، مشتاق.

**تاســـە کـــردن**: *tâsakerden* ئیـــشتیا کردن. آرزو کردن، مشتاق بودن.

**تاســـەمەن**: *tâsaman* ئارەزوومەنـــد، تاسەمەند. آرزومند، مشتاق.

**تاسیاگ**: *tâsyâg* تاسراو، تاساو. گیج شده.

**تـاش**: *tâš* تاشـە بـەرد، بـەردی گـەورەی سەرکێو. صخره.

**تاشە**: *tâša* بەردی گەورەی کێو. صخره.

**تاشیاگ**: *tâšyâg* تاشراو. تـراش خـورده، تراشیده شده.

**تاشیان**: *tâšyân* تاشران. تراشاندن.

**تاشین**: *tâšin* ها، تراشین. تراشیدن.

**تاشـــینەوە:** *tâšinawa* دووجـــار تاشاندن. دوباره تراش دادن.

**تـاف:** *tâf* کـاتی لاویـەتی و جـوانی. اوج جوانی، عنفوان جوانی.

**تاف:** *tâf* رێژنەی باران، تافگە.آبشار.

**تـاق:** *tâq* هـا، تـاك، رفـە. طـاق، رف، منفرد، یک، تنها، تک.

**تاقانە:** *tâqâna* یەکانە، تاکانە. یکی یکدانه، تك.

**تـاق و تـەنیا:** *tâqutanyâ* هـا، تـەنیا و تاك. تك و تنها.

**تـاق و جفت:** *tâqujeft* تـاق و جـووت. جمع و فرد.

**تاقەت:** *tâqat* ها، سەبر، قەرار. حوصله، توان، طاقت.

**تاقـەتگرتن:** *tâqatgerten* هـا، سـەبر کردن. تحملکردن، بردباری کردن.

**تـاقی:** *tâqi* هـا، ئـەزموون. امتحـان، آزمون.

**تاقی:** *tâqi* بەرئاورد، ئەزموون. امتحان، برآوردن، آزمایش.

**تـاقیکردن:** *tâqikerden* ئـەزموون کـردن. امتحـان کـردن، آزمـون کـردن، آزمایش کردن.

**تاقیکردنـــــــەوە:** *tâqikerdenawa* ئـەزموون کردنـەوە. عمـل آزمـون، کـردار امتحان کردن.

**تاقیـــــــەوکردن:** *tâqiyawkerden* تاقیکردنـەوە، ئـەزموون کـردن، بـەراورد کردن. آزمودن، آزمایش کردن.

**تـاك:** *tâk* تـەنیا، وەکـو (تـاك و تـەنیا). تنها، منفرد، مانند (تك و تنها).

**تاك:** *tâk* ترووك، تاق، تەنیا. تنها، تك.

**تاك:** *tâk* ئاوەڵا، باز. تمام باز.

**تاکانـە:** *tâkâna* تـەنیا، تاقانـە. یگانـە، منفرد، تك.

**تـــاك بوونـــەوە:** *tâkbunawa* جیـــا بوونەوە، لەیك بچڕان. از هم جدا شدن.

**تـاکوترووك:** *tâkuteruk* هـا، کـەموو بێش. تك تك، کم تا بیش.

**تاك و تووك:** *tâkutuk* تاك و ترووك. تك تك، دانه دانه.

**تاك و لۆ:** *tâkulō* تاك و جووت، بـەرز و نـزم، ناڕێـك. کوتـــاه و بلنـــد، نـــامنظم، ناهمگون.

**تاکیانەوە:** *tâkyânawa* جیابوونەوە به تاکی. جدا شدن، دور شدن از جمع.

**تاڵ:** *tâĭ* تامی تاڵ، وەکو (تاڵ بوو). تلخ، از انواع مزه ها، مانند (تلخ بود).

**تاڵ:** *tâĭ* هەودا. تار (یـك تـار مـو)، رشـته های عمودی قالی.

**تـاڵان:** *tâĭân* چـەپاو. تـاراج، چـپاول، تالان.

**تاڵانـــچی:** *tâĭânči* ڕێـــگر، چـــەتە، تاڵانەگەر. چپاولگر، گردنه گیر، تاراجگر.

**تاڵان کریاگ:** *tâĭânkeryâg* تاڵان کراو. تاراج شده، غارت شده.

**تـاڵانی:** *tâĭâni* چـەپاوی، شـتی تـاڵان کراو. منسوب به تالان، تاراجی.

**تـاڵاو:** *tâĭâw* ئاماژەیـە بـۆ شـەراب یـا ئارەق. تلخ آب.

**تالۆکە:** *tâlōka* تایەك پەمووو، ئاماژەیە بۆ مرۆڤی گۆشتن و قەڵەو. یك لنگە پنبە، کنایە از آدم چاق.

**تاڵی:** *tâĭi* چێژی تاڵ، دژواری. تلخی، ناگواری، سختی و مصیبت.

**تاڵێك:** *tâĭēk* هەودا یەك، یەك تاڵ. یك تار.

**تاڵینە:** *tâĭina* بریتی لە تریاك. تلخ مزه، کنایه از تریاك یکی از مواد مخدر.

**تام:** *tâm* ها، تەعم، مەزە، چێژ. طعم، مزه.

**تامدار:** *tâmdâr* بە تام، بە مەزە. طعم دار، خوش طعم.

**تامدان:** *tâmdân* چێژدان. خوش مزه کردن، مزه دادن، طعم دادن.

**تامڵ:** *tâmeĭ* سەبر. تأمل، صبر.

**تامڵکردن:** *tâmeĭkerden* سەبرکردن. تأمل کردن، صبرکردن.

**تام و خوا:** *tâmuxwâ* تام و خوێ. طعم و نمك، مزه و نمك کردن پختنی و میوه جات.

**تامەزرۆ:** *tâmazrō* ها، بە تاسە. آرزومند، مشتاق.

**تامێنە:** *tâmēna* نێوێکە بۆ ژنان. تهمینه، نام زنانه.

**تان:** *tân* تاڵی قالی، خول، دەور. تار قالی، یك دور.

**تانج:** *tânj* تاج، کڵاو پادشاکان. تاج، افسر، کلاه پادشاهان.

**تانجی:** *tânji* ها، سەگی راوچی، سەگی تایبەتی ڕاو. سگ شکاری، تازی.

**تانجیدان:** *tânjidân* ها، جێ سەگی تانجی ڕاوکەر کە لە پشتی ئوتومەبیل دایە. جای بیتوته سگ تازی.

**تانە:** *tâna* توانج، تەشەر. طعنه، تشر، کنایه.

**تانە:** *tâna* ئەوەی کە لەسەر گلێنەی چاو دەنیشێ. لکە روی چشم کە بە صورت لایه تارمانندی روی قسمت دید چشم را می‌پوشاند.

**تانی:** *tâni* توانی، لێهات. توانست، یارا.

**تانێ:** *tânē* خولێ، دەورێك. یك دور، یك چرخ.

**تانێك:** *tânēk* دەورێك تەواو، وەکو (تانێك ئەوکوژم). یك دور تمام، مانند (یك دور تو را کتك خواهم زد).

**تانێك:** *tânēk* نەختێك، وەکو (تانێك ئەوم کوتا). اندکی، مانند (اندکی او را زدم).

**تانین:** *tannin* توانین، لە توانادا بوون. توانستن، از عهده برآمدن.

**تاو:** *tâw* کاتێکی کەم، ڕێژنەی باران. وقت، زمانی کوتاه، دمی، دم، رگبار.

**تاو:** *tâw* کاتێکی کورت. زمان کوتاه، لحظه، آن، دم.

**تاو:** *tâw* سوور، خول، بەدەور گەڕاندنی توند. به دور گرداندن، چرخاندن، چرخ، دور، تاب.

**تاوان:** *tâwân* گوناح. گناه، بزه، جرم.

**تاوانبار:** *tâwânbâr* ها، گوناکار. گناهکار، مجرم، خطا کار.

**تاوانکـــار:** *tâwânkâr* گوناحکـــار. گناه‌کار، مجرم، بزه کار.
**تاوانن:** *tâwânen* تاواندن. ذوب کردن.
**تاوت:** *tâwet* تابووت. تابـوت، محفظـه ای چـوبی که مرده را در آن می گذارند و به گورستان برای دفن می برند.
**تاو تاو:** *tâwtâw* ها، جار جار. گاه گاه.
**تـاوتوو:** *tâwtu* چـه‌ند و چـۆن، تـاقی. تحقیق کردن، چند و چون.
**تـــاودان:** *tâwdân* ســـووڕدانی تونـــد. چرخاندن، تاب دادن.
**تـــاو دریـــاگ:** *tâwderyâg* تـــاو دراو. چرخانده شده، تاب داده شده.
**تـاوس:** *tâwes* مه‌لـێکی جـوان و نایـاب. طاووس، از مرغان و پرندگان بسیار زیبـا که پرهای آن بـسیار زیبـا و گرانقیمـت است.
**تاوسان:** *tâwsân* هـاوین، وه‌رزی دوومـی سـاڵ. تابـستان، فـصل گرمـا، یکـی از چهارفصل سال.
**تاوسـه‌ندن:** *tâwsanden* هـا، تـاوگرتن. سرعت گرفتن، مشتعل شدن.
**تاو گرتن:** *tâwgerten* ها، تاو سه‌ندن. تـاب گـرفتن، افروختـه شـدن، سـرعت گرفتن.
**تاوڵه:** *tâwĭa* تـۆوی گیـای گـشنیز. تخـم گیاه گشنیز.
**تاوله‌مـــه:** *tâwlama* زوغـــاڵ گه‌شـــێن (خه‌ڵوز گه‌شێن). آتش گـردان، وسـیله تاب دادن زغال مخصوص قلیان.

**تاو نه تاو:** *tâwnatâw* جار نه جار. گاه به گاه.
**تاونیـان:** *tâwniyân* بـه تاخـت رۆیـین. تاخت گذاشتن.
**تاویاگ:** *tâwyâg* تاوێندراو. ذوب شده.
**تاویان:** *tâwyân* هـا، تاویـان. گـدازش، گداخته شدن، ذوب شدن.
**تاویانـــه‌وه:** *tâwyânawa* تاوانـــه‌وه. گداخته شدن، ذوب شدن.
**تاوێك:** *tâwēk* کاتـێکی کـورت، ماوه‌یـه‌ك کورت. لحظه‌ای، آنی، زمانی کوتاه.
**تاویـه‌ت:** *tâwyat* تایبـه‌ت. مخـــصوص، ویژه.
**تاویه‌تی:** *tâwyati* تایبه‌تی. خـصوصی، ویژه.
**تایفه:** *tâyefa* هۆز. طایفه، عشیره.
**تایلـه:** *tâyla* هـا، نـێوی دارێـك و بـه‌ری داره‌کـه‌یـه. ثمـره درخـت و نـام درخـت بنگلک.
**تایله:** *tâyla* نێوی گۆرستانێکه لـه شـاری سـنه. تایـــله، گورســـتانی قدیمـــی در قسمت شمال شهرسنندج این گورستان به خاطر سابقه تاریخی و مزار بزرگـان و دانشمندان کُـرد از معروفیـت خاصـی برخوردار است.
**تر:** *ter* دیکه، تریش، وه‌کو (یه‌کێ تر). دیگر، مانند (یکی دیگر).
**ترازانـــــدن:** *terâzânden* لـــــه‌جێ ده‌رچوون، ترازانن. از جا بـدر کـردن، جـا به جا کردن.

**تـــــرازوو مـــــسقاڵ**: *terâzumesqâĺ* تـەرازوی زۆر وردکێش. تـرازوی دقیـق، مانند ترازوی زرگری و طلا فروشی.

**ترازیاگ**: *terâzyâg* تـرازاو. جـا بـه جـا شده، از جا در رفته شده.

**ترازیان**: *terâzyân* له جێگه دەرچوون. از جا به در رفتن.

**تراشـیاگ**: *terâšyâg* تاشـراو. تراشـیده شده.

**ترپ**: *terp* تـوور. ترپ، ریـشه یکـی از انواع محصولات جـالیزی از گیـاهی بـه همین نام که مصرف غذایی دارد.

**ترپه**: *terpa* دەنگی پـێ، لـه دەنگـەکان. از اصوات مانند صدای پا.

**ترپه ترپ**: *terpaterp* له دەنگەکان. از اصوات، صدای متوالی پا.

**ترِته پان**: *teŕtpân* ئاماژەیه بـۆ کەسـی تەنبەڵ. پخمه، دسـت و پـا چـلفتی، کنایـه از آدم دست و پا چلفتی.

**ترس**: *ters* ها، وەکو (بێره ماڵه کـەم لـه کی ترس ته). ترس، بیم و هراس.

**ترســـاندن**: *tersânden* ترســـاندن. ترساندن، ارعاب.

**ترســـــــانن**: *tersânen* ترســـــــاندن. ترسانیدن.

**ترس شکیاگ**: *tersšekyâg* ترس شکاو. ترس ریخته.

**ترسنۆك**: *tersenōk* ها، ترسه زاور، بـه ترس. ترسو، کم جرأت.

**ترسه زاور**: *tersazâwer* ترسنۆك. ترسو، بزدل.

**ترســـەنۆك**: *tersanōk* ترســـه زاور، ترسنۆك. ترسو، بزدل.

**ترسیاگ**: *tersiyâg* ترسێنراو، ترساو. ترسیده، هراسیده.

**ترنجان**: *terenjân* بـه زۆر جـێ کـردن. با فشار داخل کردن.

**ترنجـانن**: *terenjânen* ترنجانـدن. بـا زور و فشار جای دادن.

**ترنجـەمین**: *terenjamin* هـا، شـیرەی گیای ترەنجه بین. تـرانگبین، تـرنجبین، شیرهی گیاهی که مصرف دارویی دارد و ملین است.

**ترنجیاگ**: *terenjyâg* ترنجاو. با فشار داخل کردن، تحت فشار.

**ترنجین**: *terenjin* جێکردنەوه به زۆر. با فشار جای دادن.

**تـرۆزی**: *terōzi* هـا، چـەمەره. خیـــار چمبر، یکی از محصولات جالیزی.

**ترۆقیان**: *terōqyân* شکۆفیان. شکفتن، وا شدن.

**تـرووزانن**: *teruzânen* هـا، تووزیـان، ژانی پێست. سوز سوزکردن پوست.

**ترووسك**: *terusk* بریقه، شەوق دانەوه. درخشان، سو.

**ترووسکانن**: *teruskânen* چاولـێکنان و کردنەوه، چاو لێکنانی پەیتا پەیتا. چـشم بر هم زدن متوالی.

**ترووسکایی**: *teruskâi(i)* بریقایی. روشنایی سو سو.

**ترووســـکه ترووســـك**: *teruskaterusk* بریقدانەوه، بریقه بریق.

چشم بر هم زدن متوالی، سو سو.

**ترووکـانن**: *terukânen* ترووکانـدن، پێلوولێدان بـە تونـدی. پلک بر هـم زدن به طور متمادی.

**ترەك**: *terak* قەڵش، قلێش، درز.
ترك، درز، شكاف كوچك.

**ترەكانن**: *terakânen* ترەكاندن.
تركاندن، منفجر كردن.

**ترەكیاگ**: *terakyâg* ترەكاو.
تركیده شده، ترك برداشته شده.

**تـرەكین**: *terakin* ترەكیـان، تـەقین، قـەڵش بـردن، قڵـیش بـردن. تركیـدن، منفجر شدن.

**تـرەكین**: *terakin* تـری: *teri* دیكـەی، وەكـو (یـەكێ تـری). دیگـری، ماننـد(آن دیگری).

**تریـت**: *terit* تـێكەڵاوی نـان و چێـشت، تریت. ترید، مخلوطی از نان و آبگوشت.

**تـریش**: *teriš* هـا، تـر، ئـەوی تـر، وەكـو (ئەوان تریش). دیگر هـم، ماننـد(آن هـای دیگر هم).

**تریش**: *teriš* لـە تـار. تكه ای حاصـل از انفجار.

**ترێـشتە**: *terēšta* ئامرازێـكی نـەجارِی، پاچ، ترشته. تیشه، یكی از آلات نجاری.

**تریش تریش**: *terišteriš* لەتار لەتار.
تكه تكه شدن بر اثر انفجار.

**تریـشقە**: *terišqa* برووسكە. آذرخش، از اصوات.

**تریفە**: *terifa* تیشكی مانگ. نورماه.

**تریفـــە تریـــف**: *terifaterif* هــــا، تیشكدانەوەی تیشكی مانگ. سو سوی نـور ماه.

**تریقە**: *teriqa* دەنگی پـێكەنین. قهقهه، صدای خنده.

**تریقــە تریــق**: *teriqateriq* دەنگــی پـێكەنین، قاقا. صــدای خنــده متــوالی، قهقهه.

**تریقە تریق**: *teriqateriq* دەنگی پەیتا پەیتای پێكەنین، قاقا. قهقهه.

**تریكە**: *terika* دەنگی پێ كەنینی نزم. صدای قهقه آرام.

**تریكە تریك**: *terikaterik* دەنگی پەیتا پەیتای پێكەنینی ئارام. صدای قهقه آرام.

**تـسیاگ**: *tesyâg* تـسراو. ورم كــــردن چشم، حالتی از چشم كه پلک‌های چشم بر اثر حساسیت ورم می كند.

**تـسیان**: *tesyân* چاوی هـەڵتۆقاو بـە سراو. ورم چشم.

**تف**: *tef* ئاوی دەم. تف، آب دهن.

**تفــاق**: *tefâq* كەرەســە و پــێخۆری پێویستی رۆژانە. آذوقه، مایحتاج روزانه.

**تفلیك**: *teflik* ئاوی نێو دەم. بزاق دهن، آب دهن.

**تكا**: *tekâ* تكـا، خوایـشت، وەكـو (تكامـان لــێ كــرد). خــواهش، تمنــا، ماننــد (از اوخواهش كردیم).

**تكاكـار**: *tekâkâr* تكـا كـار. خـواهش كننده، تمَنا كننده.

**تكاندن**: *tekânden* چكاندن.

**تكانن**: *tekânen* چكانن. چكانیدن.

**تکە:** *teka* بە تنۆکە ڕژانی ئاو. چکە، ریزش قطرات آب از سقف خانه یا هر جای دیگر.

**تکە تك:** *tekatek* چکەی ئاو بەتنۆکە. چك چك.

**تکیان:** *tekyân* تکان. چکان، چکیدن.

**تگر:** *teger* تەرزە. تگرگ، قطره های یخ بسته باران.

**تـل:** *tel* خلار، گل، وەکو (تلبوونەوە بەرەو خوار). غلت، مانند (آنها به پائین غلت خوردند).

**تـلان:** *telân* گل خواردن، گلار کردن، خلار کردن. غلتان.

**تلانـن:** *telânen* تلانـدن، تلۆرانـدن. غلتانیدن.

**تلانـەوە:** *telânawa* تلاندنـەوە، تلێر خواردن. در غلتانیدن، آغشتن.

**تلاوتـل:** *telâwtel* تلـۆر تلـۆر. تلوتلو، غلتاندن.

**تڵف:** *teĭf* لم. پس مانـده مایعات، مانند دُرد شراب یا سرکه.

**تڵفاو:** *teĭfâw* لـماو. پس مانـده مایعات، مانند دُرد شراب یا سرکه.

**تلیـاك:** *telyâk* تریـاك، مادەیـەکی هۆشبەرە. تریاک، مـأخوذ از یونـانی بـه معنـای افیـون و شـیره ی آن خاصـیت سُکرآوری دارد که از پوست سـبز گیـاه خشخاش تولید می شود.

**تلیاگ:** *telyâg* تلاو، گلاو. آغشته شده، غلت خورده شده.

**تلـێر:** *telēr* گلار، گلـێر. غلـت، بـه دور خود چرخیدن و غلت خوردن.

**تلـێرەوە بـووگ:** *telērawbug* گـلارەو کـراو، تلـێرەوە کـراو. غلتیـده شـده، در غلتیده.

**تلیسیاگ:** *telisyâg* تلیساو، فیسراو. وارفته در آب.

**تلیـسیان:** *telisyân* فیـسراو، لـه ئـاو دا شکڵ لە دەستدان. وارفتن در آب.

**تڵیش:** *teĭiš* هـا، قـەڵش، قڵیش. شـکاف، درز.

**تڵیشانن:** *teĭišânen* تڵیشاندن. شکافتن.

**تڵیشیاگ:** *teĭišyâg* تڵیشاو، تڵیشراو. پاره شده، شکافته شده.

**تلێفۆن:** *telēfōn* تەلـەفۆن. تلفن، یکـی از وسایل ارتباطی.

**تلین:** *telin* تلۆر، گلۆر. غلت، غلتیدن.

**تمەز:** *temaz* تمەس تۆ دەڵێی. تو گویی، مثل اینکه.

**تمـەس:** *temas* تمـەز، وەکـو (تمـەس وای کردوو). بی خبـر، توگـویی، ماننـد (تـو گویی بدون اطلاع من کاری را انجام داده بود).

**تمەن:** *teman* پارەی دەورانی قاجارەکان. تومان برابر ۱۰ ریال.

**تنۆك:** *tenōk* تاڵ تاڵ. تار تار، تنك.

**تنیـاگ:** *tanyâg* تـەناو، تـەنراو. تنیـده شده، بافته شده، مانند بافتن تور.

**تـۆ:** *tō* لا، چـین، وەکـو (سـەرتۆی مـاس). قشر، لایه، مانند (لایه و قشر چربـی دار روی ظرف ماست تازه).

**تواسیاگ**: *twâsyâg* تەواسراو. منزجر شده، رم کرده شده.
**تواشا**: *twâšâ* تەواشا، تماشا. تماشا، نگاه.
**تواشا خانه**: *twâšâxâna* تیاتر، جێگای شانۆ. تماشاخانه، تأتر.
**تواف**: *twâf* تەواف. طواف، زیارت.
**توافەت**: *twâfat* جیاوازی. تفاوت، جدایی، فرق.
**توانەوه**: *twânawa* ها، تاواننەوه، تاواندنەوه. دوباره ذوبکردن.
**توانین**: *twânin* تانین. توانستن، قادر بودن.
**تواو**: *twâw* تەواو، دوایی پێ هاتن. تمام، پایان، آخر.
**تواو**: *twâw* ها، تاوراو، تاوناو. ذوب شده، آب شده.
**تواو کردن**: *twâwkerden* تەواو کردن. تمام کردن، به آخر رسانیدن.
**تواوەتی**: *twâwati* تەواوی، به تەواوی. تمامی، همگی.
**تۆپ**: *tōp* ها. توپ، یکی از وسایل ورزش جمعی.
**تۆپ**: *tōp* دوایین لوتکە. آخرین حد ارتفاع.
**تۆپ**: *tōp* ها، تۆپی پارچه. واحدی برای بسته بندی پارچه.
**تۆپان**: *tōppn g* کایە بە تۆپ، یاری تۆپ. توپ بازی، بازی با توپ.
**تۆپانن**: *tōpânen* تۆپاندن. کشتن جانوران حرام گوشت.

**تۆپ تاو**: *tōptâw* تۆپچی. توپچی، تیرانداز توپ.
**تۆپز**: *tōpez* ا، مەشعەل. شعل، از وسایل روشنایی کە پارچە آغشته بە مواد سوختنی را بر سر یک تکه چوب می بستند و روشن می کردند.
**تۆپ قاڕ**: *tōpqâŕ* کایەی تۆپ. بازی با توپ.
**تۆپلاخە**: *tōpĭâxa* خڕکردنەوەی قوریان بەفر. گلوله، گلوله مانند.
**تۆپەڵە**: *tōpaĭa* گروور، خڕ. گلوله، گردی.
**تۆپەڵە بەفر**: *tōpaĭabafer* بەفری گروور کراو، بەفری خڕکراو. گلوله برف.
**تۆپیاگ**: *tōpyâg* تۆپاو. جاندار حرام گوشت مرده.
**تۆپین**: *tōpin* ها، مردارەو بوون. مردن جاندار حرام گوشت.
**تۆ تۆ**: *tōtō* لالا، تۆ تۆ، چین لە سەر چین. لایه لایه، چین چین.
**توخماخ**: *toxmâx* کوتاندنی سەر بە گورز. تقماق، کوبانیدن سر با گرز تقماق.
**توخماخ**: *toxmâx* ها، ئامێریکی تایبەت بە وردکردنی کوڵۆ. تقماق، تکه چوب سنگینی که با آن کلوخ را می کوبند، نوعی تهدید برای خرد کردن طرف.
**توخن**: *toxen* نزیك، تووش. نزدیك، جوار.
**تۆراغ**: *tōrâγ* تۆراخ. ماست چکیده.

**توراغـان**: *tōrâγân* تۆراخـان. خیـــک مخصوص ماست چکیده از جنس پوست بز یا گوسفند.

**تۆرانن**: *tōrânen* تۆراندن، زیر کردن. وادار نمودن به قهر.

**تورش**: *torš* ترش. ترش، از مزه‌ها.

**تورشاو**: *toršâw* ترش ئاو، ترشاو. آب ترش مزه.

**تـورش و شـیرین**: *toršuširn* تـرش و شیرین. ترش و شیرین، از مزه ها.

**تورشی**: *torši* ترشی، ترشیات. ترشـی، مخلوطی از سرکه یک یـا چنـد نـوع از میوه و سبزی های خوردنی کـه پـس از طی مراحل خاص و زمـان مناسـبی بـه عنوان نوعی از مخلفات سفره مصرف می کنند.

**تورشی**: *torši* ترشی. ترشی، هر چیـزی که طعم ترش بدهد.

**تورشیاگ**: *toršeyâg* ترشاو، رووترش. ترشیده کنایه از آدم اخمو و دختر مسن.

**تورشی جات**: *toršijât* ترشیجات.

**تورك**: *tork* تورك. ترك، یکی از ملل که در ترکیه، قفقاز، ترکمنستان و در قسمتی از ایران زندگی می کنند.

**تورم**: *torm* نەخۆشی سەرما خواردن. سرما خوردگی، زکام.

**تورمه**: *torma* شاڵی تورمه. ترمـه، شـال ترمه.

**تورنـا**: *toŕnâ* شـەلاخ یـان پارچـەیەکی گرێ بەستکراوە کە با ئەدرێ لە یاریدا بە کاری دەبەن. شلاق یـا پارچه گـره داده ای است کـه در بـازی ترنـا از آن اسـتفاده مـی کنند.

**تورنابـازی**: *toŕnâbâzi* نـێوی یاریەکـە کـە لـە قدیمـدا لـە نـێوچاپخانەکاندا لـە شەوانی مانگی رمەزان باو بوو. بازی ترنا، یکـی از بـازی هـا و سـرگرمی هـای سـنتی جوانان در قدیم.

**تـورەنج**: *toranj* نـەخش و نگارێـك لـە قـاڵی سـنەدا. تـرنج، یکـی از نقـش و نگارهای قالی و قالیچه در سنندج.

**تورەنج**: *toranj* نێوی بـەری دارێکە کە بۆنی خۆشی هەیە. ترنج، نام میـوه ای از مرکبات با پوستی ضخیم و خوشبو که به آن بالنگ گفته می شود.

**تۆریـاگ**: *tōryâg* تـۆراو، زیـز کـراو، تۆردراو. قهر کرده.

**تۆرین**: *tōrin* کاری تۆران، زیز بوون. قهر کردن.

**تـۆزاوی**: *tōzâwi* هـا، خـۆڵاوی. گـرد آلوده، خاك آلودگی.

**تۆژاڵ**: *tōžâĭ* سەرتوی ماست یان شیر. لایه نازك روی شیر یا ماست یـا یـخ بـستن آب.

**تـۆژاڵ**: *tōžâĭ* نـەختێ، زۆرکـەم. انـدك، بسیار اندك، کم.

**تۆسقاڵانەیك**: *tōsqaĭâneyk* نەختـێك، کەمێك. اندکی، کمی، مقداری کم.

**تۆشە**: *tōša* زاد، بژێوی سەفەر. توشه، ره آورد.

**تۆشەوەر**: *tōšawar* تۆشە بـەر. توشـه، رهاورد

**تۆف**: *tōf* هەوای سارد. سرمای زیاد.

**تۆفانە**: *tōfâna* مێشوولە. پشە، از انواع حشرات موذی.

**تۆقانن**: *tōqânen* ترساندن. ترسانیدن، به هراس انداختن.

**تۆقە تۆق**: *tōqatōq* دەنگی لێکدانی شتی سەخت. از اصوات، تق تق شدن.

**تۆقیـــاگ**: *tōqyâg* تۆقـــاو، ترســـاو. ترســـیده شـــده، از هـــم واشـــدن، ترکیـــدن تاول.

**تۆقین**: *tōqin* ترسین لە ناکاو. ترسـیدن ناگهانی.

**توکـــوڵ**: *tōkoĭ* توێـــکڵ. پوســـته چـــوب، مانند(پوست گردو یا میوه های مشابه).

**تۆکڵە**: *tōkĭa* توێـکڵە. پوســـته، رویـــه، حفاظ هسته.

**تۆکڵە گوێز**: *tōkĭagwēz* توێکڵە گوێـز. پوستەی گردو.

**تۆڵاش**: *tōĭâš* توێکڵ چێو. پوست چوب.

**تۆڵاشە**: *tōĭâša* پێستی کەنراوی چـێو. پوست کنده شدەی چوب.

**تۆم**: *tōm* توو، وەکو (تۆم کاڵەك). تخم، دانه، بذر، مانند (تخمه خربزه).

**تۆماتـێز**: *tōmâtēz* تەماتـە. گوجـــه فرنگی، یکی از محصولات جالیزی.

**تۆم خەیار**: *tōmxayâr* تووی خەیار. تخم خیار.

**تۆم ڕۆژگار پەرێز**: *tōmŕōžgârparēz* تووی گوڵە بەڕۆژە. تخم آفتابگردان.

**تـــۆم کوولەکـــە**: *tōmkulaka* تـــووی کوولەکە. تخمه کدو.

**تۆمەت**: *tōmat* تۆمەت، قسە هەڵواسین. تهمت، افترا.

**تۆم هەنی**: *tōmhani* تۆوی شووتی. تخم هندوانه.

**تون**: *ton* توند، وەکو (ئەو بیبارە تونە). مزه تند، طعم تند، مانند (آن فلفل تنـــد است).

**تون**: *ton* توند. تند، سریع، با شتاب.

**تون و تاڵ**: *tonutâĭ* تاڵ و توند. تنـــد و تلخ مزه یا طعم تند و تلخ.

**تونوتیـــژ**: *tonutiž* توندوتیـــژ، گـــورج، بەگوڕ. تند و تیز، سوزان، چست و چالاك، مزه تند.

**تونـــە مـــەجاز**: *tonamajâz* مرۆڤـــی توورە. عصبانی، خشن.

**توو**: *tu* ها. توت، یکی از انواع میـوه هـای درختی.

**تـووار**: *tuâr* نـاوی گوندێـکە سـەر بـە شاری سـنە. نـام دهـی درحـومە سـنندج بیـن راه سنندج ـ مریوان.

**تووتانن**: *tutânen* تووتانـدن، بـە فێـرە قسەکردنی منـداڵ. بـه حـرف در آوردن و یاد دادن حرف به بچه.

**تووتـك**: *tutek* بێـچووی سـەگ. تولـه سگ.

**تووتە**: *tuta* ئەنگوستی بچووکی دەست. انگشت کوچك دست.

**تووتەکۆڵە**: *tutakōĭa* بێـچووی سـەگ. توله سگ.

**تووتی**: *tuti* یەکێ لـە باڵنـدەکان. طوطی یکی از انواع پرندگان.

**تووڕ**: *tuŕ* فڕێدان. پرت، دور، کنار.
**تووڕك**: *tuŕek* تووترك. تمشك، میوه‌ای شبیه به شاه توت به رنگ قرمز مایل به سیاه.
**تـووڕه**: *tuŕa* ئـالۆز، زیـز. عـصبانی، خشمگین.
**تووره‌که**: *turaka* هـا، تـووره‌ك، جـه‌والّی بچووك. کیسه کوچك، خوجین، توبره.
**تـووڕه‌یی**: *tuŕai(i)* ئـالۆزی، تونه‌مه‌زاجی. عصبانیت.
**تووزانـدن**: *tuzânden* هـا، ژان کردنـی پێستی ده‌ست یا پـێ. سوزش، درد ناشـی از ضرب شلاق یا تازیانه.
**تـووزه**: *tuza* ژانـی پێست. درد ناشـی از شلاق.
**تـووزه تـووز**: *tuzatuz* چـووزاندنه‌وه. درد ممتد ناشی از شلاق خوردن.
**تووزیان**: *tuzyân* ها. سوزش ناشـی از ضربت تازیانه.
**تووش**: *tuš* ئه‌وقه، توشیار. دچار، گریبان گیر.
**تووش**: *tuš* ده‌سته و یه‌خه. گلاویز.
**تووش**: *tuš* دژوار، ئه‌سته‌م. سخت، دشوار.
**تـووش نـه‌وزه‌ر**: *tušnawzar* نێـوی ته‌پۆلکه‌یه‌که لـه به‌شـی رۆژهـه‌لاتی شـاری سـنه. توس نوذر، نام تپـه ای در مـشرق شهر سنندج که در میـان عامـه مـردم شهر به این نام معروف است.
**تووشـیار**: *tušyâr* تـووش هـاتن. دچـار، گریبان گیر.

**تووفه‌ره‌نگی**: *tufarangi* هـا، چه‌شنـێك تـوو. توت فرنگی،یکی از محصولات مهم کشاورزی در سنندج.
**تـووك**: *tuk* تـووت، وه‌کو (تـووك شـۆڕ). دماغ، بینی.
**تـووك**: *tuk* کولّك. کُرک، موهای نـازک صورت یا دست.
**تووکـانن**: *tukânen* هـا، تووکانـدن. شکستن، مانند (تخمه شکستن).
**تـووك شـۆڕ**: *tukšōŕ* لـووت شـۆڕ. دمـاغ دراز، کنایه از تکبر است.
**تووکن**: *tuken* ها، کـولّکن. پـشمین، پـشم آلود، کسی که موی زیاد بر بدن دارد.
**تووکنه**: *tukna* کولّکنه، زۆر به موو. پُرمو.
**تووکه تووك**: *tukatuk* تـرووکه ترووك. صدای نم نـم بـاران، صـدای شکـستن تخمه.
**تووکیاگ**: *tukyâg* تووکاو. شکسته شده، از پوسته به در آمده با دندان.
**تoونکه**: *tunka* شوالّی کورت. شورت.
**تoونه‌وان**: *tunawân* توونتاو. تون تاب، کسی که کـار او روشـن نگـه داشـتن تـون و گرم کردن حمام بود.
**تoونه‌وانی**: *tunawâni* توونتـاوی. تـون تابی.
**تووه ڕه‌شه**: *tuaŕaša* گاتوی ڕه‌ش. توت سیاه، یکی از انواع تـوت کـه بـسیار آب دار است.

**تــووه ســووره:** *tuasura* شــاتوو. تــوت سرخ، یکی از انواع تـوت کـه بـسیار آب دار است.

**تـووه وشـکه:** *tuaweška* تـووی وشـك کراو. توت خشك شده.

**توویچ:** *tuič* تۆش، ئەتۆش. تو هم.

**توه تـوه:** *twatwa* تۆتـۆ، لا لا. چین در چین، لایه به لایه..

**توێڵ:** *twēĭ* تەوێڵ. پیشانی، جبین.

**توێڵه:** *twēĭa* تەوێـڵه. طویلــه، اســطبل چهارپایان اهلی مانند اسب.

**تۆیەك:** *tōyak* لایـەك، چینـێك. قـشری از آن، لایه‌ای.

**تـەپ:** *tap* یـەکی لـە دەنگـەکان. یکــی از اصوات.

**تەپاڵـە:** *tapâĭa* پـێژراو لـە سەنـێر بـۆ ئــاگردان. تپالــه، از مدفــوع دام تولیــد مـی‌شـود و بـرای سـوخت زمـستـان و امـور دیگـر از آن اسـتفاده می شود.

**تەپانن:** *tupânen* تەپاندن. چپاندن، بـا زور فرو کردن.

**تەپتــــەپان:** *taptapân* ئاماژەیــــە بــــۆ کەسێکی کەم تەرخەم. کنایه از آدم دست و پا چلفتی.

**تـەپڵ:** *tapeĭ* هـا، ئامـێرێکی مۆسـیقایی، تـەپڵ. طبــل، یکــی از انــواع ســازهای سنتی.

**تەپلاخ:** *tapĭâx* تۆپلاخ. مشتی از گل یا ماده‌ای مشابه.

**تەپلاخه:** *tapĭâxa* تۆپلاخه. مـشتی از گل، گلوله‌کردن، گلوله شدن.

**تەپڵژەن:** *tapeĭžan* ها، ئەوەی کە تەپڵ لـێ دەدات. طبال، طبل نــواز، کــسی کــه حرفه او نواختن طبل است.

**تەپڵ سەر:** *tapeĭsar* تەوقی سەر، بـانی سەر. فرق سر، بالای سر.

**تـەپوتۆز:** *taputōz* هـا، تـەپودوو، تـۆز کردن. گرد و خاك.

**تەپۆڵە:** *tapōĭa* نـێوی گەڕەکـێکی شـاری سنەیە (سـەرتەپۆڵە). نـام محلـه‌ای قـدیمی در سنندج.

**تەپۆڵە:** *tapōĭa* تەپۆڵکە. تپه کوچك.

**تەپە:** *tapa* لە دەنگەکان، زرمە. تــپ، از اصوات.

**تەپە:** *tapa* تەپۆڵکە. تپه، کوه کوچك.

**تەپە تۆراغان:** *tapatōrâγân* ئاماژەیـە بـۆ کەسـی قەڵەو و تەنبـەڵ. کنایـه از آدم بسیار چاق و تنبل.

**تەپە تەپ:** *tapatap* لە دەنگەکان، زرمە زرم. تپ تپ کردن، از صداها.

**تـەپیاگ:** *tapyâg* تـەپاو. تپیـده شـده، فرو رفته شده.

**تەپیان:** *tapyân* ها، قوپان. تپیدن، فـرو ریزش.

**تەپیان:** *tapyân* تـەپین. ریزش چاه یــا آوار به صورت فرورفتگی.

**تەپین:** *tapin* ها. تپیدن، فرو ریختن.

**تەپین:** *tapin* تەپێندراوی. فرو ریزش.

**تەپینەوە:** *tapinawa* دووجـار تـەپین، قووپانەوە. تپیدن دوباره، باز فرو ریزش.

**تە تە:** *tata* نێوی ملەیەکە لە هەورامان، نام گردانــه‌ای در اورامان.

**تەتەڵە:** *tataĺa* گۆناو لاجانگ. قسمت گونه در صورت.

**تەتەڵــە:** *tataĺa* بەشــی روومــەت و لاجانگ. استخوان گونه.

**تەجروبــە:** *tajroba* ئــەزموون. تجربــە، آزمون.

**تەجرەبــە:** *tajraba* ئــەزموون. تجربــە، آزمون ه.

**تەجــەرە:** *tajara* نــێوی گوندێــکە. نــام روستایی در حومه سنندج.

**تەحر:** *taĥr* سیما، شکڵ. شکل، قیافه.

**تــەخت:** *taxt* کــەت. تخــت، وســیلەای کــه روی آن بخوابند، اریکەی شاهان.

**تەخت:** *taxt* ساف. صاف، هموار.

**تـــەختانی:** *taxtâni* راســـتایی، وەکـــو (ئــەێرە تەختانیــە). راســتایی، همــواری، مانند (اینجا هموارى است).

**تەختایی:** *taxtâi(i)* راستایی، سافایی. همواری.

**تەختە:** *taxta* چێوی داتاشراوی پان. تخته، تکه چوب برش داده شده و پهن.

**تەختــە بــەن:** *taxtaban* بــە تەختــە چنراو. تختەبند، چوب یا تخته حایل.

**تەختە نەرد:** *taxtanard* ها، کەرەسەی یاری کردنێکە بەم ناوە. تخته نرد،یکی از صنایع چوبی ویژەی سنندج که از چوب گردو و گلابی ساخته می شود و مرکــب است از دو لایه ۳۰مهره سیاه و سفید،

**تەخـشان:** *taxšân* پــەخش کردنــەوە لــە رادە بەدەر پووڵ و پارە. ریخت و پاش، ولخرجی.

**تەخشان و پەخشان:** *taxšânupaxšân* بەخشین بەهۆی دڵخواز. داد و دهش، دست و دلبازی کردن، ولخرجی کردن.

**تــەڕ:** *tař* هــا، خووســراو. خــیس، تــر، نمناك.

**تەڕاڵ:** *tařâĺ* مەلێکی راوکەر ئاماژەیە بۆ تەمبەڵ. تنبل، لش، اهمال کار، ترلان.

**تەڕایی:** *tařâi(i)* هاف جێ تەڕ. زمین آب خورده، خیسی.

**تەڕ بوون:** *tařbun* ها، تر شدن. خیس شدن.

**تــەڕ بــە تــەڕی:** *tařbatařı* تەڕاوتــەڕی. در حالت خیسی.

**تەڕچك:** *tařček* ناسك، شینکەی تازە. ترد، نازك، شکننده.

**تـــەرخان:** *tařxân* هـــا، تایبـــەت دان. مختص، اختصاص، ویژه.

**تەرخون:** *tarxon* تــەرخوون، ســەوزیکی خــواردن. ترخون، یکی از اقــلام ســـبزی های خوراکی که طعم تند و بوی خوش و خاصیت گرما زایی دارد.

**تەڕدەس:** *tařdas* زۆر زرەنگ لە یاریدا. زبردست، ماهر.

**تەڕدەسی:** *tařdasi* تەڕدەستی، زرەنگی. مهارت، تردستی.

**تــەرز:** *tarz* چــڵی ناســك، لقــێکی ناســك. ساقه نازك و جوان.

**تەرز:** *tarz* شێوە، روش. طور، شیوه.

**تــەڕ زوان:** *tařzwân* تــەڕ زمــان. تــر زبان، متملق.

**تـەڕ و تووشـی:** *tarutuši* کـاتی بـاران و هەور و هەڵا. زمان بارندگی و ابر.

**تـــەرزە:** *tarza* هـــا، چـــڵی ناســـکی دار. تگرگ، شاخە نازك درخت.

**تەرسا:** *tarsâ* سەر بەئاینی عیسا. ترسا، عیسوی.

**تەرم:** *tarm* لاشەی مردوو. جنازە، نعش.

**تـەڕە تیـزە:** *taŕatiza* هـا، تـەڕە تـوورە، سەوەزیەکە کە بۆ خـواردن دەشـێ. سبزی شاهی یا ترتیزک یکی از انـواع سـبزی های خوردنی کە طعمی تند دارد.

**تـەرەس:** *taras* هـا، جنـێویکە. پـست، رذل، در اصطلاح ناسزا است.

**تەڕە ساڵ:** *taŕasâĭ* ساڵی پڕ باران. سال پُر باران.

**تەرەك:** *tarak* درز، قەڵش، قڵیش. قاش، ترك، شکاف.

**تەڕە کاڵ:** *taŕakâĭ* بێستان کێڵ، کەسێ کە سەوزە کاری دەکا. سبزی کار، کسی کـە در جالیز کار می‌کنند.

**تــەڕە کــاڵی:** *taŕakâĭi* بێــستان کــاری، وەبەرهەمهێنانی سەوزیجات. سبزی کاری.

**تـــــەرەکانن:** *tarakânen* ترەکانـــــدن، تەقاندن. ترکاندن، منفجر کردن.

**تـەرەکیاگ:** *taŕakyâg* ترەکـاو. ترکیـدە شدە، منفجر شدە.

**تـەڕە گمـێز:** *taŕagemēz* میـزی کـاڵ. ادرار، شاش.

**تەڕەماش:** *taŕamâš* چێشتی ماش، وەکو دەڵێن ئاماژەیە بۆ قوزە لقورت. آش ماش، کنایە از زهرمار و کوفت کاری.

**تەڕەمـێز:** *taŕamēz* میـزی کـاڵ. ادرار، شاش.

**تـەڕەوبووگ:** *taŕawbug* تـەڕە و کـراو. دوبارە تر شدە یا خیس شدە.

**تەڕی:** *taŕi* تەڕایی، نمین. نمناکی، خیس.

**تەرێـق:** *tarēq* شـەرم، تـەریق. شـرم، شرمندگی، خجالت.

**تەرێقە:** *tarēqa* تەرەقـە. ترقـە،یکـی‌از انواع موادانفجاری کوچکـە معمـولا عیـد نوروز بچەها از آن استفادە می‌کنند.

**تەرێـقەت:** *tarēqat* تەریقـەت، رێـبازی عیرفـانی. طریقـــت، روش و ســـلوک صوفیان.

**تەرێـقەوبووگ:** *tarēqawbug* تـەریق کـراو، خەجاڵـەت دراو. خجالـت کـشیدە، شرمندە شدە.

**تەرێــــــــقەوبوون:** *tarēqawbun* شـەرمەزاربوون، تەریقبوونـەوە. شـرمندە شدن.

**تەرێقی:** *tarēqi* شەرمەزاری، تەریقی. شرمندگی.

**تـەریك:** *tarik* چـۆڵ، سووچـێکی چـۆڵ. دنج، گوشە، خلوت.

**تەز:** *taz* سڕ، سڕی، گۆتی، تەزو. کرختی اندام.

**تەزانن:** *tazânen* ها، تەز پیاهێنان. این واژە بە صـورت کنایـەای مصطلح اسـت بە معنـای حـس کـردن و مـات کـردن شخص مقابل است.

**تەزیاگ:** *tazyâg* تەزراو، تـەزاو. تزیـدە شدە، خواب رفتن دست یا پا.

**تـــەزیان:** *tazyân* تەزینـــەوە. تزیـــدن، خواب رفتن دست یا پا.

**تەزین:** *tazin* ها. بە خواب رفتن دست و پا کرخت شدن.

**تەژدید:** *taždid* دوبارە کـاری، سـەر لـە نویٚ ئەزموون دان بـۆ قوتابییـان بـە هـۆی نەهـێنانی نمـرە (دەرەجـە)ی پیویـست. تجدید، نو کـردن، از سـر گـرفتن امـری یـا کاری.

**تەژە:** *taža* ها، مروڤی قەد و بالاّ بولنّدی بیٚ کارە و بـیٚ کـەلّك. قـد بلنـد، کـسی کـە قدی بلند دارد و کردار او سست است.

**تەسـك:** *tasek* تـەنگ، کـەم بـەر. کوتـاە، نارسا.

**تەسەل:** *tasal* تێر، تەواو. تمام، کامل.

**تەشـــبی:** *tašbi* هـــا، وەك. تـــشبیە، مشابهت.

**تەشت:** *tašet* دەفری شتن. تشت، ظرف بزرگ مخصوص لباس شستن یا هر چیز دیگری.

**تەشقەلّە:** *tašqaĭa* رشقەن، رشخەن. شکلك، درآوردن.

**تەشـك:** *tašek* شـکلّ و روالّـەت، وەکـو (تواشـا تەشـکی). شـکل و قیافـە، ماننـد (قیافەاش را نگاه کن).

**تەشـك:** *tašek* تـەرح، قـەوارە. شـکل و قیافە، شمایل، قوارە و هیکل.

**تەشەر:** *tašar* تانە، توانـج. تشر، طعنە، کنایە.

**تەشـــەنە:** *tašana* هـــا، بلاوەســـەندن، هەمـەگیر، بلاّبوونـەوە. سـرایت، گـسترش، توسعە پیدا کردن.

**تەشـی:** *taši* هـا، ئـامیری تایبـەت بـە خـوری رێـستن. دوك نـخ ریـسی از جـنس چوب.

**تەشـی رێس:** *tašiŕēs* هـا، کەسـێك کـە تەشی دەرێسی. دوك ریس، کسی کە کار او دوك ریسی است.

**تەغار:** *taγâr* ها، تـەخار. تغـار، ظـرف سفالی مخصوص ماست و هم چنین برای تهیە خمیرنان.

**تەغارێك:** *taγârēk* هـا، یـەك تـەخار. برابر است با ۳۰ عدد تخم مـرغ و یـا بـە اندازە یك تغار.

**تـەفاوەت:** *tafâwet* جیـاوازی. تفـاوت، ویژگی.

**تـــەفتیش:** *taftiš* پـــشکنین. تفتـــیش، وارسی، بازرسی.

**تـەفروتوونا:** *tafrawtunâ* بـیٚ سـەر و شوێن. مفقود الاثر، ناپیدا، گم و گور.

**تەفرە:** *tafra* کات بە سەر بردن بـەفیڕۆ. تفرە، وقت گذرانی، دفع الوقت.

**تەفرە دان:** *tafradân* کات بە فیڕۆدان. تفرە دادن، وقت گذرانی کردن.

**تەق:** *taq* لە دەنگـەکان. تق، از اصـوات مانند صدای ضربە چوب یا سنگ.

**تەقالا:** *taqâlâ* هەولّ و تێکۆشان. تلاش، کوشش، تقلا.

**تەقانن:** *taqânen* تەقاندن، ترەکانـدن. ترکاندن، منفجرکردن.

**تـــەقانن:** *taqânen* بـــێژنگ کـــردن. غربال کردن، سرند کردن.

**تەقتەقان:** *taqtaqân* نێوی گەڕەکێکی شاری سـنە. نام محلەای در شهر سنندج، صدای انفجار، راه بسیار سنگلاخی.

**تەقـە:** *taqa* لـە دەنگـەکان، دێـق، زاڵـە چوون. دق، زهر ترک، صدای انفجار.

**تەقە:** *taqa* لـە دەنگـەکان. تقه، یکـــی از اصوات.

**تەقە تەق:** *taqataq* دەنگی زۆری تەق. تق تق، از اصوات.

**تەقە دیـان:** *taqadiyân* ددان لـە یـەك دان بە هـۆی مووچـڕك. صـــدای بـــە هـــم ساییده شدن دندان ناشی از لرز.

**تەقـــەڵ:** *taqaĭ* بەخیـــە، دوورانـــدن بـــە دەرزی، وەکو (تەقەڵ لێ دریاگ). دوخت.

**تەقـەڵ دریـاگ:** *taqaĭderyâg* تەقـەڵ دراو. دوخته شده.

**تەقـــەڵ لـــێدان:** *taqaĭlēdân* هـــا، دوورانـدن. دوختن، بخیه زدن.

**تـــەقوتۆق:** *taqqutōq* هـــا، تـــەق و ترووق. تق و توق، از اصوات.

**تـــەقودەو:** *taqudaw* هاتوچـــۆی زۆر، تێکۆ شانی زۆر بۆ داهات. زیاد تقلا کردن، تلاش برای معاش.

**تەقیاگ:** *taqyâg* تەقیو. منفجر شده.

**تەقیاگ:** *taqyâg* تـەقاو، بـێژنگ کـراو. الك شده، غربال شده، سرند شده.

**تـــەقین:** *taqin* بـــێژنگ کـــردن. فعـــل بیختن، غربال کردن.

**تـــەقین:** *taqin* هـــا، تـــرەکین، تـــۆقین. انفجار، از هم متلاشی شدن.

**تەك:** *tak* پاڵنان، تەکدان بۆ حەسانەوە. تکیه دادن، لم دادن.

**تـەك:** *tak* لەگـەڵ. همـــراه، ضـــمیمه، پیوست.

**تەك:** *tak* یەك، بە تـەنیا، یـەکی. تـــک، یک، تنها.

**تەکانـــدن:** *takânden* هـــا، تـــەکانن. تکاندن، به لرزش درآوردن درخـت بـا هـر چیز مشابه دیگر.

**تەکانن:** *takânen* تەکاندن. تکاندن، بـه جنبش در آوردن، به لرزش در آوردن.

**تەك تـۆ:** *taktō* لەگـەڵ تـۆ. بـاتو، همـراه تو.

**تـــەکمان:** *takmân* لەگـــەڵمان، وەکـــو (لەتـــەکمان بـــوو). همـــراه، بـــا مـــا، مانند(همراه ما بود).

**تەکـە:** *taka* پاڵـدان، لاچـوون، پێـشەو چوون. جابجا شدن در جا، لم دادن.

**تەکـە:** *taka* تەکـدان، تـەك بـدە، بجووڵـە بەولاوە، کەمێ بچۆ بەو لاوە، وەکو (تەکـە بـەو لاوە). حرکت، جنبش، مانند(بـــه آن طرف حرکت کن).

**تەکە تـەك:** *takatak* لەرەلـەر. شـل و ول راه رفتن، تلوتلو، تکان تکان.

**تەکـــە تەکـــە:** *takataka* تەکدانـــەوە، پاڵدانەوە. به تدریج جلـــو رفـــتن یـــا بـــه جوانب مختلف جهت رسیدن به مقـــصود مورد نظر.

**تــەکی**: *taki* پــلاو خورشــتی تێکــەڵاو. ترکیبی از پلو خورشت.

**تەکیا**: *takyâ* لەگەڵیا. همراهش، پیوست او.

**تـەکیا**: *takyâ* تـەکا، وەکـو (پـەتووە کـە تەکیا). تکانده شده، مانند (پتو تکاندنه شد).

**تکیــاگ**: *takyâg* تکــاو، چــکاو. چــکیده شده.

**تەکیاگ**: *takyâg* تـەکاو. تکانـده شـده از بالا.

**تەکیــە**: *takya* خانــەقا، جێگــای زکــری دەروێشان. تکیه، خانقاه درویشان.

**تەکیە**: *takya* پشتدان، پاڵدان. تکیـه، لم دادن، پشت دادن.

**تــەڵ**: *taĭ* یــەکێ لــە شــتێ. یـك عـدد از چیزی، یك دانه از چیزی.

**تەل**: *tal* تەل، سیم. مفتول سیمی، سیم.

**تــەڵا**: *taĭâ* زێــڕ. طــلا، فلــز گرانبهــا و کمیاب.

**تەلار**: *talâr* ها، تالار. تالار، ایوان وسیع.

**تەڵاق**: *taĭâq* جیـا بوونـەوەی ژن و شـوو لە یەك. طلاق، متارکه.

**تەڵاقدان**: *taĭâqdân* جیا کردنەوەی ژن لـە مـێرد بـە پـێی یاسـای شـەرع. طــلاق دادن.

**تــەڵاکاری**: *taĭâkâri* زێــڕکاری. طـــــلا کاری، زراندود.

**تەڵبژێـــــر**: *taĭbežēr* هــــا، تەڵـــچن. برگزیدن، گزینش، گلچین.

**تەڵچن**: *taĭčen* تەڵبژێر. گلچین، بهترین انتخاب.

**تەڵقین**: *taĭqin* ها، باوە ڕاندن. تلقین.

**تەڵــە**: *taĭa*داو. تلــە، دام، وســیلەی کــار شکارچیان.

**تەڵـــــەزم**: *taĭazem* درز، قــــــەڵش، پارچەیەك بەرد یان دار. درز، شکاف.

**تەڵەکە**: *taĭaka* بـاج. بـاج، وجهـی را بـا زور و اجبار گرفتن.

**تەڵە مـشك**: *taĭamešk* تەڵەی تایبـەت بە گرتنی مشك. تله موش.

**تەڵەو**: *taĭaw* لای ئـەو، تەڵەب. طلــب، جانب او.

**تـەلیس**: *talis* هـا، بـەردی گـەورە. سـنگ بزرگ.

**تەلیسم**: *talisem* جادوو کراو. طلــسم، جادو.

**تەلیــسان**: *talisman* چەرمــێك کــە بــۆ درەو کردن لە سەری دەبەستن. چرمی که درو گران بر پیشانی خود در زمان درومی بندند.

**تەلیـــسە**: *talisa* پەیکـــەر، پەیکـــەرە. مجسمە، تندیس.

**تەڵێك**: *taĭēk* تەڵێك، یەکێك لـە شـتێ. یك عدد، یك دانه، یك شاخه نازك.

**تەم**: *tam* مژ، تاریکایی بەرچاو. تار، مە.

**تــەما**: *tama* چـاوە ڕێ، ماتـڵ. انتظـــار، چشم به راه.

**تەمادار**: *tamâdâr* ها، چاوەڕێ. چــشم انتظار، معطل، منتظر.

**تەماکار**: *tamâkâr* تەماعکار، بە تەماع.

طماع، آزمند، حریص.

**تــەماکۆ:** *tamâkō* هـا، تــەماکۆ. تنبـاکو.

**تەماوی:** *tamâwi* مژاوی. مه آلود.

**تەمتەمــە:** *tamtama* نــووکی بزمــاری مەزرێچ. نوعی میخ.

**تـــەمر:** *tamer* کاغــەزی عەکـــسداری ســەرنامە، تــەمبر، دراۆ. تمبـــر، یکـــی از اوراق بهــادار بــرای ارســال محــصولات پستی که بر روی مرسوله می چسبانند.

**تەمیس:** *tamis* خاوێن، پاك. تمیز، پاك.

**تەمیـــــــــــسکردن:** *tamiskerden* خاوێنکردنەوە. تمیزکردن، پاککردن.

تەمیــسی: *tamisi* خاوێــنی. تمیـــــزی، پاکی، نظافت.

**تەمومژ:** *tamumež* هەوای مـژاوی. مـه گرفتگی.

**تـــەمووره:** *tamura* ســـازی تـــەمبوور، ئامێریکی مۆسیقای تایبـەت بـە ڕێـڕەوانی یارسان. تنبور، یکی از آلات موسیقی که دارای دسته بلند و کاســه کوچــک کــه درآیین‌های کهن عرفانی کُرد از سازهای اصلی بوده و اکنــون نیز مورد استفــاده اهل حّق یا (یارسان ها) قرار دارد.

**تەمـــــەریاگ:** *tamaryâg* داسەپــــێو، داسەپاو. تمرگیده.

**تەمەڵ:** *tamaĭ* تەمبەڵ. تنبل.

**تەمەڵخانــە:** *tamaĭxâna* تەمبەڵخانــە. کنایه از محل اطراق آدم های تن لــش و راحت طلب.

**تەمەڵی:** *tamaĭi* تەمبەڵی. تنبلی.

**تــەنافباز:** *tanâfbâz* کەسێك کـە بـە سەرگوریــسی ڕایــەڵکراودا دەڕوا. بنــد بـاز، آکروبات.

**تەنانــەت:** *tanânat* هـا، بەتــەنیا. حـتی، حتی این که، به ویژه.

**تەنتەنە:** *tantana* شکۆ، فەڕ. عظمــت، شکوه، جلال.

**تەنك:** *tanek* تاك، تنۆك. تنك، یك در میان.

**تـەنك:** *tank* بەینابـەین چاندراو. تنـك، مفرد، یکتا.

**تەنکــە:** *tanka* کەرســەی تایبـــەت بـــە نــەوت. وســیلەای بــرای حمــل و نقــل و نگهداری نفت حلب.

**تەنکــە:** *tanka* بەشـــی خــوارووی زك. قسمت پایین شکم.

**تەنکە:** *tanka* دەفری تایبەتی نەوت. جا نفتی، حلب کوچك نفت.

**تەنکەی سـك:** *tankaysek* بەشـی ژێـر ناوکی زك. قسمت زیر ناف شکم.

**تەنگ:** *tang* دژی گوشاد، تەسك. تنگ، نارسا.

**تەنگانــە:** *tangâna* هـا، کـاتی گـرنگ و ئەستەم. زمان و فرصت کم.

**تەنگانە:** *tangâna* کاتی ئەستەم. تنگنا، زمان سختی و حسرت.

**تــەنگز:** *tangez* دارێــکی بنــچکە و بــە دڕك. درخت بادام کوهی، درخت ارژن.

**تەنگس:** *tangs* دارێکی بنچکە و بەدڕك. درخت بادام کوهی، درخت ارژن.

**تەنگوتورش:** *tangutorš* زۆر تەنگەبەر. بسیار تنگ.

**تەنگە نەفەس:** *tanganafas* هەناسە سوار. تنگ نفس، نفس تنگی، ناشی از بیماری ریوی.

**تەنوور:** *tanur* ها، تەندوور. تنور، جای مخصوص پختن نان.

**تەنوور داخستن:** *tanurdâxesten* تەندوور داخستن. روشن کردن تنور.

**تەنیا باڵ:** *tanyâbâĭ* تەنیا کەس بۆ داهاتی رۆژانە. بی یار و یاور.

**تەنیاگ:** *tanyâg* تەناو، تەنراو. تنیده شده، بافته شده.

**تەواسین:** *tawâsin* ڕەمکردن. رم کردن، منزجر شدن.

**تەورێز:** *tawrēz* شارێك لە ئێران کە ناوەندی پارێزگای ئازەربایجانی رۆژهەڵاتە. تبریز، مرکز آذربایجان شرقی و یکی از شهرهای بزرگ و صنعتی ایران.

**تەوریوەر:** *tawriwar* ناوی گوندێکە سەر بەشاری سنە. نام روستایی در حومه سنندج.

**تەوفیر:** *tawfir* ها، جیاواز. فرق، جدا، تفاوت.

**تەوق:** *tawaq* ئاڵقەی ئاسنین، تەوقی سەر. طوق، حلقەی فلزی، روی سر.

**تەون:** *tawen* ها، داری قاڵی. قالی بافتن، قالی روی دار برای بافتن.

**تەونەگەر:** *tawenagar* قاڵیکەر. قالی باف.

**تەوەر:** *tawar* ئامرازێ هەرەسکردنی دار. تبر، وسیله بریدن درخت یا چوب.

**تەوەر:** *tawar* ها، تەور، تەبەر. تبر، آلتی برنده با دستەی کوتاه و تیغەی پهن بری بریچن درخت.

**تەوەرزین:** *tawarzin* تەوری دەستی دەروێشان. تبر زین، تبر مخصوص درویشان.

**تەوەسیاگ:** *tawasyâg* تەوەساو. رم کرده، منزجر شده.

**تەوەسیان:** *tawasyân* ڕەمکردن. رمیدن، منزجر شدن.

**تەوەق:** *tawaq* سینی، تەبەق. طبق، سینی مد ور بزرگ چوبی.

**تەوەق:** *tawaq* چەشنێ نەخۆشیی ئاژەڵ. نوعی بیماری در دام.

**تەوەنە:** *tawana* دەورەدان، گەمارۆ. محاصره، دوره گرفتن، محاصره کردن.

**تەیار:** *tayâr* ساز و ئامادە. آماده، قبراق، سرحال.

**تێ:** *tē* دێ، دێت، وەکو (ئەو تێ). می‌آید، مانند(او خواهد آمد).

**تێ:** *tē* یەکێ لە پیتەکانی ئەلفووبێ. ت، از حروف الفبا که (تِ) تلفظ می‌گردد.

**تی:** *ti* دیی، دییت، وەکو (تۆ تی). می‌آیی، مانند(تو خواهی آمد).

**تیا:** *teyâ* تێدا، لەناویدا. درون آن، اندرون آن.

**تیاماگ:** *teyâmâg* تیاماو، تێداماو. درمانده.

**تیامانـــــدن**: *teyâmânden* تـــێمان. درماندن، درماندگی.

**تیانــچه**: *tiyânča* مەنجــەڵی بــچووك. نـوعی دیـگ کوچـك کـه معمـولاً از جـنس مس است.

**تیانه**: *tiyâna* مەنجەڵی گەورە. دیگ بزرگ مخصوص طبخ غذا.

**تیتـاڵی**: *titâĭi* جەفـەنگی کـردن، گاڵتـه کردن، رشخەن. تمسخر، مسخره کردن.

**تیتەوە**: *titawa* دەگەڕێیتەوە، دێیتەوە. باز می گردی، بازخواهی گشت.

**تــــیر**: *tir* هــان، هــەڵخڕان، وەکــو (تیرکریاگـــه). تحریـــك، وادار، ماننــــد (تحریك شده است).

**تـیر**: *tir* تیـشکی خـۆر، وەکـو (بـه تـیر خوەرەو). اشعه خورشید.

**تــیر**: *tir* نوبــەی یــاریکردن لــه یــاری مێشاندا. نوبت بازی در تیله بازی.

**تـیر**: *tir* هاوتەمـەن، وەکـو (لـه تـیر ئـەو کوڕەسه). هم سن، هم اندازه، ماننـد (هـم سن وسال آن پسر است).

**تیر**: *tir* فیشەك، وەکو (تیر تفەنگ). گلوله تفنگ یا اسلحه دیگر.

**تـێر**: *tēr* دژی برسـی. ســیر، متـــضاد گرسنه.

**تـێر ئـاو**: *tēr âw* بـه تەسـەلی ئـاو خواردەنەوە. سیرآب.

**تیران**: *tirân* نێوی یارییەکە. نوعی بازی برد و باخت با سکه یا سنگ.

**تێربووگ**: *tērbug* تـێر بـوو، تـێر کـراو. سیر شده.

**تێربوون**: *tērbun* دژی برسی بوون. سیر شدن.

**تێر خواردان**: *tērxwârden* به تەسەلی خواردن. سیر خوردن.

**تیر خوەر**: *tirxwar* تیشکی خۆر، وەکو (بــه تــیر خــوەرەو ئەڕۆیتــەوە). نــور خورشـید، ماننـد (هنـوز آفتـاب غـروب نکرده برمی‌گردد).

**تـێر کـردن**: *tērkerden* تەسـەل کـردن. سیر کردن.

**تــێر کریــاگ**: *tērkeryâg* تــێرکراو، تەسەل کراو. سیر کرده شده.

**تێڕمان**: *tēŕmân* تێبەردان. انداختن و به دور انداختن سریع.

**تێروتەسەل**: *tērutasal* دژی برسی. بـه اندازه کافی سیر و بی‌ا شتها.

**تیرە**: *tira* ئەسڵ، بناخـه، رەگـەز. تیــرە، طایفه، ایل، اصل خانوادگی.

**تــێرەخوەر**: *tēraxwar* بــه تەســەلی خواردوو. سیر خورده.

**تیرە ناز**: *tiranâz* تیرهاوێژ. تیرانداز.

**تـیرە نـازی**: *tiranâzi* تـیر هاوێـشتن. تیراندازی.

**تیرە نان**: *tiranân* ئامرازێکی داریـن بـۆ پانکردنـەوەی هـەویر. چــوب مخــصوص پهن کردن چونه خمیر برای تهیه‌ی نـان لواش.

**تیری**: *tiri* جۆرێ نانی ساجی. نـان تـیری، لواش ساجی.

**تێری**: *tēri* دێنی، وەکو (ئەو کتێوە تێری بۆمــان). مــیآوری،ماننــد (آن کتــاب را برایمان میآوری).

**تـێری**: *tēri* دژی برسـیەتی، وەکـو (تـۆ تـێری). سـیر هـستی، گرسـنه نیـستی، مانند(تو سیر هستی).

**تـــــێریتەو**: *tēritawa* دێـــــنیتەوە. میآوریدش، میآوری، باز خواهی آورد.

**تیــزانگ**: *tizâng* فوودانـــە، ئـــامرازی لاستیکی کە فووی تێ دەکەن. بادکنك.

**تیژ**: *tiž* دژی کول، تێژ. تیز، برنده، برا.

**تیــژی**: *tiži* دژی کـولی، تـێژی. تیــزی، برندگی.

**تێسرەواندن**: *tēsarawânden* لـێدانی لە ناکاو. ضربە زدن ناگهانی و فوری.

**تێسرەوانن**: *tēsarawânen* لـێدان لـە ناکاو. ضربه زدن ناگهانی و فوری.

**تیـسك**: *tisk* کـولکی نـەرمی دەموچـاو، هوشـوی بـچووکی هـەنگوور. مـوی نـرم، کُرك مو، خوشەی کوچك انگور.

**تیسکن**: *tisken* ها، کولکن. کسی که موی نرم و تازه زیاد دارد.

**تێسمــێڕیاگ**: *tēsemēŕyâg* قــەد ئەستووری پتەو، تێسمێڕدراو. قوی هیکل، غول پیکر.

**تـێقولاندن**: *tēqoĭânden* تـێ کوتانـدن بە پەلە. فرو بردن ناگهانی.

**تیکلە**: *tikla* دەفرێکی تایبـەت بـۆ ماست یـان ڕۆن، ئاماژەیـە بـۆ مرۆڤـی خـرپن و کورتـە بـالاٚ. ظرف سفالی مخصوص روغن یـا ماست، اصـطلاحی کنایـه ای از آدم چاق و کوتاه قد نیز هست.

**تێکمە**: *tēkma* لێوانلێو، پڕ. پُر، آکنـده، انباشته.

**تیکە**: *tika* لـەت، لوقمـە. تکـه، قطعـه، لقمه.

**تـێکەڵ**: *tēkaĭ* هـا، ئامـێتە، ئاوێـتە. مخلوط، درهم.

**تێکەڵاو**: *tēkaĭâw* ها، تـێکەڵ. آغشته، درهم، مخلوط.

**تـێگەیگ**: *tēgayg* تێگەیـشتوو، لـێ حالێبوون. آگاه، دانا، با تجربه، مطلع.

**تـێڵی**: *tēĭi* دێـڵی. می گذاری، اجازه مــی دهی، فرصت می دهی.

**تـێڵا**: *tēĭâ* داردەست، چـێوی تایبـەت بـە دەست. چوب دستی، چماق.

**تـێڵم**: *tēĭem* ئەهـێڵم، دێـڵم. اجـازه میدهم.

**تێڵمی**: *tēĭemi* دێڵمی، دەیهێڵم. اجازەاش میدهم.

**تێڵین**: *tēĭin* دێڵین. اجـازه مــی دهــیم، فرصت می دهیم.

**تێم**: *tēm* دێم، وەکو (من تێم). میآیـم، مانند(من خواهم آمد).

**تیمـار**: *timâr* هـا، دەرمـان. معالجـه، درمان، مداوا.

**تــێماگ**: *tēmâg* تــێماو. درمانــده، وامانده.

**تـین**: *tin* گـەرما، شـەرا. گرمـای آتـش، حرارت.

**تین**: *tin* دێن، وەکو (ئێمە تین). میآییم، مانند(ما خواهیم آمد).

**تێن**: *tēn* دێن، وەکو (ئێوە تێن). میآیید، مانند (شما خواهید آمد).

**تـێن**: *tēn* دێـن، وەکـو (ئـەوان تـێن). میآیند، مانند (آنها خواهند آمد).

**تینگ**: *tineg* تینوو. تشنه، نیازمند به آب.

**تینگی**: *tinegi* تینوویەتی.(تشنگی).

**تینەت**: *tinat* نیهاد خده. نهاد، ضمیر، طینت.

**تێوەشانن**: *tēwašânen* تێبەربوون بە پەلە. هجوم بردن و برهم زدن، ضربت زدن ناگهانی.

**تـێوەشیان**: *tēwašyân* تـێبەربوون بەپەلە. هجوم بردن و برهم زدن.

# ج

**جا**: *jâ* دواجار، وەکو (جا تێمەوە). پس، آنگاه، بعد، مانند (پس بر میگردم).

**جا**: *jâ* ها، جادە، ڕێگای گەورە. جاده، راه اصلی.

**جـــاجم**: *jâjem* جاجـــیم، جـــاجمی دەســـتکردی ســـنە زۆر بـــە نـــاو بانگـــە. جاجـم، نوعی بافتنی از نخ های رنگـین پشمی که از آن به عنوان رختخواب پیچ یا پتو استفاده می کننـد، جـاجم بافـت سنندج از معروفیت خاصـی برخـوردار است.

**جاچکە**: *jâčka* بنێشت، جاچکە. آدامس، سقز.

**جاچـکەتاڵە**: *jâčkatâĭa* بنێـشتە تاڵـە. سقز تلخ، ون، محصول درخت ون.

**جادار**: *jâdâr* جێنشین، جێدار. جانشین، جادار، نایب (دال مهمله است).

**جـادوو**: *jâdu* سـێحر، جـادوو. جـادو، سحر.

**جادووباز**: *jâdubâz* سێحرباز. جادوگر، ساحر.

**جادووگـــــەر**: *jâdugar* ســـــێحرباز. جادوگر، ساحر.

**جاڕ**: *jâŕ* بانگی بەرز، بانگەشە. جار، اعلام، بانگ، فریاد.

**جاڕ**: *jâŕ* جاڕ. زمین شخم نزده.

**جار**: *jâr* کەڕەت. بار، دفعه.

**جـاران**: *jârân* بـەر لـە ئێـستە، کـاتی پێشوو، کاتی رابـردوو. سـابقاً، زمـانی در گذشته و دور.

**جـار جـار**: *jârjâr* بـەین بـەێن. گهگـاه، وقت به وقت.

**جار جارە**: *jârjâra* بەینابـەین. گاه بـه گاه.

**جاڕکێـشان**: *jâŕkēšân* ئاگادارکردنـەوە گشتی بەدەنگی بەرز، بانگـەواز، بانگەشـە. جارّ دادن، صدا در دادن.

**جاروبـــار**: *jârubâr* کـــات کـــاتێ، بـــە هەڵکەوت، بەێن بـەێن، گـا گـا. گهگـاه، گـاه گاه، گاه و بی گاه.

**جـارە جـارە**: *jârajâra* بـەینا بـەین. گاهی نه گاهی.

**جارێ**: *jârē* کاتـێك، وەکـو (جـارێ چـووم بـۆ لای). یـك وقـت، بعـداً، زمـان دیگـر، مانند(یك وقت پیش او رفتم).

**جارێك**: *jârēk* ئیسته نه، نەجارێ. حـالا نه، فعلاً نه.

**جارێك**: *jârēk* کاتێك، دەمێك. یک بـار، یک زمان، وقتی که گذشته است.

**جارێکان**: *jârēkân* سەردەمێ، زەمانێك. زمانی، زمانی در گذشته.

**جارێـکان**: *jârēkân* ئیستەنە، نـەجارێ، نەختێ سەبرکە. بار دیگر، فعلاً نه، اندکی صبر کن.

**جارێـك تـر**: *jârēkter* کاتـێك تـر، کـەڕە تێك تر. بار دیگر، وقتی دیگر.

**جارێــك لــە جــاران:** *jârēklajârân* کاتـێکی تایبـەت. دفعـــەای از دفعـــات در گذشته.

**جـاش:** *jâš* بەچـکە کـەر، بێـچـوەی کـەر، ئاماژەیـــە بـــۆ کەســـێك کـــە بووبێتـــە دارەدەستی دوژمـن. کـره الاغـی کـه هنـوز بار بر او نهاده نشده است، کنایـه از کسی که با دشمن دست به یکی کنـد و بـه ملت خویش خیانت نماید.

**جاشەکەر:** *jâšakar* بێـچووەی کـەر. کـره الاغ.

**جاف:** *jâf* ناوی عشیرەتێکە لە هەورامانی لهۆن. نام عشیرەای در جنوب کردستان.

**جاکــەت:** *jâkat* کراســی گــەرم. ژاکــت، نوعی پوشاك گرم.

**جـام:** *jâm* ئاوێـنە، لەتـێکی شووشـە یـان ئاوێنە. جام، شیشه، آینه.

**جامانە:** *jâmâna* چەشـنێ مـێزەرە یـان شاڵی سەر. نوعی از دستار سـر مـردان بـه رنگ های سیاه قرمز و سبز بـا خـال هـای سفید.

**جامبـــــاز:** *jâmbâz* فـــێڵباز. شـــیاد، کلاهبردار، حقه باز.

**جامبازی:** *jâmbâzi* فێڵبازی. شیادی، کلاهبرداری، حقه بازی.

**جامقولیباز:** *jâmqolibâz* فێڵباز. شیاد، مکار.

**جامێعە:** *jâmē a* ئاماژەیە بـۆ مزگـەوتی گەورە. مسجد جامع.

**جانتا:** *jântâ* هەنبانە. توبره، همیان.

**جـانگی:** *jângi* جـانگ، قـژی کـە نـاری جانگ. شقیقه، موی کنار شقیقه.

**جانەوەر:** *jânawar* زیندەوەر. جانور.

**جاوانن:** *jâwânen* جاواندن. جویدن.

**جـاوگ:** *jâweg* جـاو، کۆتاڵـێکی دەسـت چن. کرباس، نوعی پارچه دست بـاف کـه از پنبه بافته می شود.

**جـاوە جـاو:** *jâwajâw* جاوانـەوەی بـە پەسا. جویدن متوالی آرام.

**جـاوی:** *jâwi* کـاری جـاوین لـە رابـردوو. جوید، با دندان جوید.

**جاویـاگ:** *jâwyâg* جاوێنـدراو، جـاواو، جاوراو. جویده شده، با دندان خرد شده.

**جـــاوین:** *jâwin* جـــەوین، جاوانـــدن. جویدن، چیزی را زیر دندان خرد کردن.

**جـرت و فـرت:** *jertufert* زۆر هەڵکەوت و داکەوت. بازیگوش.

**جرتێ فرتێ:** *jertēfertē* هەرزە. هـرزه، جلف، بازیگوشی.

**جـرز:** *jerz* درز، قـەڵش، قڵـیش. جـرز، درز، شکاف، باریك.

**جڕوجانـــــــــــەوەر:** *jeŕujânawar* زینـــدەوەرانی ورد، دەعبـــا. جـــانوران، حشرات، وحوش.

**جریکـــانن:** *jerikânen* جریکانـــدن. صدای گنجشک، جیک جیک کردن.

**جریکــە:** *jerika* دەنگــی باڵنــدە وەکــو دەنگی چۆلەکە. صدای گنجشک، جیک.

**جریکــە جریــك:** *jerikajerik* دەنگــی پەلەوەر. جیک جیــک، صــدای متــوالی گنجشک.

**جز:** *jez* دەنگی برژاندنی گۆشت. صدای جلز.

**جزوبز:** *jezubez* دەنگی تاواندنەوەی رۆن. از اصوات مانند صدای پختن گوشت روی منقل یا ذوب کردن روغن.

**جزە:** *jeza* جز لە زاری منداڵان. اصطلاح بچەگانە برای سوختن و ترسانیدن از سوختن به کار می رود.

**جفت:** *jeft* جووت. جفت، زوج مقابل، دو گاو نر و ماده که برای شخم زدن به هم می بندند.

**جفت و گا:** *jeftugâ* جووت و گا. نگاه به جفت.

**جفتە:** *jefta* لەقە، جووتە. جفتك، لگد پرانی ستور.

**جفتە پا:** *jeftapâ* جووتە پێ. ایستادن سریع، خبردار نظامی، جفت پا.

**جق:** *jeq* کەم شیرین، وەکو (ئەو هەنگوورە شیرین جق بووگە). شیرین مزه، مانند (آن انگور طعمی رو به شیرینی دارد).

**جل:** *jel* زین و بەرگی ئەسپ. پلاس روی اسب و گاو.

**جل:** *jel* ها، جلوبەرگی مروڤ. لباس، البسه.

**جلشۆر:** *jelšōr* ئەوەی کە جل دە شۆرێ، چێوی جلشۆری. رختشوی، چوب مخصوص رختشویی.

**جلشۆردن:** *jelšōrden* جل شتن. لباس شستن.

**جلشۆری:** *jelšōri* جل شتن. لباس شستن.

**جڵف:** *jeľf* ئەخلاق سست، رەوشت سووك. جلف، قرت، سبك سر.

**جلکوت:** *jelkōt* دارای جل شتن. چوب مخصوص جهت شستن لباس.

**جلوبەرگ:** *jelubarg* پۆشاك. لباس، البسه.

**جڵەوخان:** *jeľawxân* پێشخوان دەروازە. جلوخان، پیشگاه دروازه، ساحت.

**جلیسقە:** *jelisqa* جلیقه، جلیتقه. نیم تنه بدون آستین که زیر کُت می پوشند.

**جمان:** *jemân* خرۆشاندن. جنبیدن، حرکت کردن.

**جمس:** *jems* جووڵە. جنب، حرکت.

**جمگە:** *jemga* جومگە. مفصل مچ دست یا پا.

**جموجووڵ:** *jemujuľ* بزوتنی زۆر. جنبش، لرزش، تکان.

**جمە:** *jema* خرۆش. خروش جمعیت، آینده جمعیت.

**جمیاگ:** *jemyâg* جووڵێنراو. به حرکت درآمده شده.

**جمین:** *jemin* بزووتن، بزووتنی جەماوەر. جنبیدن دسته جمعی.

**جن:** *jen* جن، جنۆکە. جن، موجودی نامرئی که از آن روایتها دارند.

**جنانن:** *jenânen* ورد وردکردن، جنانـدن، جنـران. تکه تکەکردن، ریز ریزکردن، گوشت چنجەکردن.

**جن گیر**: *jengir* ئەو کەسەی کە بە پێ بۆچوونی خۆی خەریکی گرتنی جنۆکەیە وەکو ئەوانەی کە کاری سێحر و جادوو دەکەن. جن گیر، سحار، جادوگر.

**جنۆکە**: *jenōka* ئەجنە، کۆی جن. اجنه، از موجوداتی که روایتهای زیادی از آن دارند

**جنین**: *jenin* وردکردن بە چەقۆ. ریز ریزکردن، تکه تکەکردن مانند برش دادن گوشت، کباب و جنجه.

**جۆ**: *jō* جۆگە، جوب. جوی آب، آبراه باریک و طولانی در باغ ها و مزارع.

**جوالْ**: *jwâľ* کیسە گەورە دغل. جوال، کیسه بزرگ نخی که برای حمل بار استفاده می شود.

**جوان**: *jwân* لاو، گەنج. جوان، انسان یا حیوان که به میانه عمر طبیعی نرسیده باشد.

**جوانــاو**: *jwânâw* ئاوی لای لێوی مردوو. مایع کنار دهان، عرق رخسار قبل از مرگ، عرق و مایع تر شده در زمان مرگ و احتضار که در صورت مرده مشاهده می شود.

**جوانخاس**: *jwânxâs* جوانچاك، لاوچاك. جوان زیبا، خوش تیپ.

**جوانکەڵە**: *jwânkaľa* جوانکەلە، تازە بەتەمەنی لاوی گەیشتوو، تازەلاو. کوچولوی زیبا، خوش صورت، کنایه از کسی که سیمای جوان دارد، جوانک، نوجوان.

**جوانن**: *jwânen* لەقاندن، جوڵاندن. تکان دادن، به جنبش در آوردن، جنباندن.

**جوانەمەرگ**: *jwânamarg* ها. جوان مرگ، نوعی دعا که می‌تواند هم شر باشد و هم خیر، مانند (الهی جوان مرگ شوی یا الهی جوان مرگ نشوی).

**جواو**: *jwâw* وەڵام، جواب.جواب، پاسخ.

**جواوات**: *jwâwât* وەڵامەکان. جواب ها، پاسخ ها.

**جواوجۆ**: *jwâwjō* بەشوێن وەڵامەوە بوون. در جستجوی جواب، جواب جو.

**جواو جۆ**: *jwâwjō* وەڵامدانەوە بەتوندی. جواب جو، به دنبال جواب، نوعی گستاخی کوچکتر دربرابر بزرگتر.

**جواوکردن**: *jwâwkerden* جوابکردن. جوابکردن، نپذیرفتن، ردکردن.

**جواو کریاگ**: *jwâwkeryâg* جواب کراو، جواب دراو، رەتکردن. جواب کرده شده، رد شده، پذیرفته نشده.

**جواوێ**: *jwâwē* وەڵامێك. جوابی، پاسخی.

**جواهێر**: *jawâhēr* جەواهێر. جواهر، گوهرها، زیورآلات قیمتی.

**جواهێرات**: *jawâhērât* جەواهێرات. جواهرات، زیورآلات قیمتی.

**جۆر**: *jōr* وەك، چەشن. نوع، شیوە، جور، گونه، طور، مانند، یکنواخت.

**جۆراوجۆر**: *jōrâwjōr* جۆراوجۆر، هەمە چەشنە. گوناگون، متنوع، رنگارنگ.

**جۆربــوون:** *jōrbun* ڕێــکبوون. جــور شدن.

**جورە:** *jośa* ها. جیرجیرك، یکی از انواع حشرات که به رنگ برگ و گیاهان است.

**جۆری:** *jōri* ڕێکی، ڕێکبوون، جۆر بـوون. جور شدن، یکنواخت شدن.

**جۆرێ:** *jōrē* چەشنێ، تەرزێ. طوری، نوعی، شیوەای، به گونەای.

**جۆرێــك:** *jōrēk* تەرزێــك، شــێوەیەك، چەشنـێك. نــوعی، شــیوەای، طــوری، طرزی، حالتی.

**جۆڕین:** *jōŕin* زمـان بـە هەڵەدا چـوون. تپق، اشتباه لفظی.

**جـۆش:** *jōš* زیپکـەی دەموچـاو. جــوش، جوش صورت.

**جۆشــین:** *jōšin* کـوڵین، جـۆش هــێنان. جوشاندن، درحال جوش.

**جۆق:** *jōq* تاقم، دەستە. دسته، گروه.

**جـۆق جـۆق:** *jōqjōq* بـە تـاقم، دەسـتە دەستە. دسته دسته، گروه گروه.

**جۆگـە:** *jōga* جـۆ، جۆگـە. جـوب، آبـراه کوچك، جوی.

**جۆگەلـە:** *jōgala* جۆگــە، جــۆ. جــوب، جوی آب، آبراهه.

**جۆلاّ:** *jōĭâ* شاڵ باف، جاجمچن. جولا، نساج.

**جۆماڵ:** *jōmâĭ* خاوێنکەری جۆگەی ئاو. کسی که لاروبی جوب می کند.

**جومعــە:** *jom a* ڕۆژی هــەینی. جمعــه، آدینه، هفتمین، روز هفته.

**جمکۆت:** *jemkōt* جمکوت، لێوانلێو، پـڕ. پُر، انباشته، لبریز، ازدحام، مالامال.

**جوومڵە:** *jomĭa* رسته، بەیەکەوە. جملـه، همه، همگی، کلام و سخنی که مفید معـنی دهد.

**جونە:** *jona* سۆزمانی، جندە، ژنی حیز. جنده، روسپی، زن بد کاره.

**جـوو جـوو:** *juju* ئاماژەیـە بـە گیـان لـە بەری بچووك لە زاری منداڵەوە. اشاره به جانوران کوچک در اصطلاح بچگانه.

**جووجەڵـە:** *jujaĭa* جووچـکی، مریـشك. جوجه پرندگان و طیور.

**جووجەڵە:** *jujaĭa* بێچووەی مـەل. جوجه پرنده امّا بیشتر به جوجه طیور اتلاق می گردد.

**جووچکە:** *jučka* کلك، دوو. دُم، دنباله.

**جووچکە بڕیـاگ:** *jučkabeŕyâg* کلك بڕاو. دُم بریده اصطلاحی کنایه ای است.

**جـووز:** *juz* دەنگـی زۆر ناسـك و باریـك. جوز از صداها، مثلاً صدای سماور.

**جووزنــە:** *juzena* دەنگـی زۆر ناسـك و باریك، کەسێك که جوزەی دێ. از اصوات، صدای خفیف، کسی که این صدا را بطور مرتب دارد.

**جـووزە جـووز:** *juzajuz* لـە دەنگـەکان. جوزجوز، از اصوات خفیف.

**جووڵــە:** *juĭa* جمــش، جوولــە. تکــان، حرکت.

**جووڵە جـووڵ:** *juĭajuĭ* جووڵـە کـردن. لولیدن، حرکت آرام و درجا.

**جووڵیاگ:** *juĭyâg* جووڵاو. تکان خورده شده.

**جوێن:** *jwēn* جنێو. دشنام، فحش.

**جوێن فرۆش:** *jwēnferōš* جنێو فرۆش. هتاك، فحاش.

**جویین:** *jwin* جووڵینەوە، جووڵەکردن. جنبیدن، تکان خوردن، جابجایی، حرکت آرام.

**جەحانم:** *jaĥânem* جێگەی بەڵێند راوی تاوانباران. جهّنم، دوزخ، جای گناهکاران.

**جەخت:** *jaxt* دەرفەتی تایبەت، پژمە. صبر، شانس آوردن، عطسە، تأکید هم معنی می دهد.

**جەڕ:** *jaŕ* توند کێشان و بەستن بە توندی. پیچاندن، محکم بستن.

**جەڕاح:** *Jaŕâĥ* برینگەڕ، کاردۆژەکەر، نشتەرگەر، شکستە بەند. جراح، شکستە بند سنتی.

**جەڕانن:** *jaŕânen* بە توندی بەستن، جەڕدان. محکم پیچاندن و بستن.

**جەربزە:** *jarbaza* غیرەت، شەهامەت، دڵ قەوی. جربزە، یارا، شهامت.

**جەڕجەڕە:** *jaŕjaŕa* چەرخی ئاو هەڵکیشان لەبیر. چرخ چاە.

**جەڕدان:** *jaŕdân* گووشین، بە توندی بەستن. پیچانیدن، بستن، محکم.

**جەڕدریاگ:** *jaŕderyâg* جەڕدراو. محکم بستە شدە.

**جەرز:** *jarz* درز، قەڵش، قڵیش. نگاە، جرز.

**جەرگ سووزیاگ:** *jargsuzyâg* جەرگ سووتاو، ئەولا مردوو. اصطلاحی دال بر فرزند از دست دادە.

**جەرگ و دڵ:** *jargudeĭ* جگەر و دڵ. دل و جگر، کنایە از دوست داشتن، کنایە از با جرأت بودن.

**جەڕە جەڕ:** *jaŕajaŕ* لە دەنگەکان. از اصوات مانند صدای چرخ آب.

**جەڕیاگ:** *jaŕyâg* جەڕدراو، جەڕاو. پیچاندە شدە، بستە شدە با طناب شتک دادە شدە.

**جەزرەبە:** *jazraba* ئازار، جەزرەوە. آزار، اذیت، رنج.

**جەژن:** *jažen* جێژن، شادی. جشن، شادی، سرور، خوشی، مسرت، بساط میهمانی.

**جەژنانە:** *jažnâna* جێژنانە. عیدی، عیدی دادن.

**جەرگ:** *jareg* جگەر، لە زاری خەڵکدا ئاماژەیە بە فەرزەند. جگر، کنایە از فرزند.

جەرگ بڕیاگ: *jaregbeŕyâg* جەرگ بڕاو، ئەوڵاد مردوو. فرزندە مُردە.

**جەسە:** *jasa* ئەندام، لاشە. تن، بدن، کالبد و جسم انسان.

**جەعبە:** *ja ba* ها، قوتوو. جعبە.

**جەفا:** *jafâ* جەور، جەفا. جور، جفا، ستم.

**جەلوو:** *jalu* ئەڵوات، هەرزە. اوباش، لات.

**جەلەب:** *jalab* فێڵباز، قیناوی. حقە باز، کینەتوز.

**جەم**: *jam* گەل بەستن، كۆ، كۆمەڵ، وەكو (ئێمە زەمانێ جەممان جەم بوو). جمع، گرد هم آمدن، مانند (ما زمانی جمعمان جمع بود).

**جەمام**: *jamâm* كوترانی لەش، ژانی لەش بەهۆی رەقبوونی ئەندام. كوفتگی عضلات كە بر اثر كار سنگین یا ورزش ایجاد می شود.

**جەمەو بوون**: *jamawbun* كۆ بوونەوە. جمع شدن، گرد هم آمدن.

**جەمێك**: *jamēk* كۆمەڵێك، دەستەیەك. جمعی، عدەای، كثیری.

**جەمین**: *jamin* توێڵ. جبین، پیشانی.

**جەنجاڵ**: *janjâĭ* هەراو هوو. جنجال، شور و غوغا، آشوب و ازدحام.

**جەنەت**: *janat* ها، نێوی گەڕەكێكی قەدیمی لە دەوروبەری عەمارەتی وەكیڵ لە شاری سنە. جنت، نام محلەای قدیمی در محدودە ساختمان عمارت وكیل در شهر سنندج.

**جەنەرباخی**: *janarbâxi* نێوی باخێكی قەدیمی لە سنەدا. باغی قدیمی در شهر سنندج.

**جەور**: *jawr* جەفا. جور، جفا، ستم.

**جەورئاوا**: *jawr âwâ* نێوی گەڕەكێكە لە شاری سنە. جورآباد، نام محلەای در شهر سنندج.

**جەوهەر**: *jawhar* جەوهەری نووسین، شیرەی دەن. جوهر نوشتن، معرب گوهر، اصل و خلاصە چیزی.

**جەوهەر جاچكە تاڵە**: *jawharjâčkatâĭa* ها. مایع حاوی تریبانتین كە از تقطیرصمغ وَن بە د ست می آید و مصرف دارویی دارد در رفع درد رماتیسم مؤثر است.

**جەوە**: *jawa* لەقكراو، لە جێ كەنراو. لق، ازجا كندە.

**جەوین**: *jawin* جاوین، جاواندن. جویدن، چیزی را زیر دندان خُرد كردن.

**جێ**: *jē* جێگا، نوێن. جای، بستر، رختخواب.

**جیا**: *jiyâ* جودا، دوور لە یەك. جدا، دور از هم، مفصل، متمایز.

**جیا بوونەوە**: *jiyâbunawa* ها، لەیەك جیا بوون، دابڕان. كردار و عمل جدا كردن، جدا كردنی.

**جیاتی**: *jiyâti* لە جیاتی، لە جێگای، وەكو (لە جیاتی بڕوایت). بە جای، مانند (بە جای آنكە می رفتی).

**جیا جیا**: *jiyâjiyâ* جودا جودا، لە یەك ترازان. جدا جدا، گسستە از هم.

**جیاكردنەوە**: *jiyâkerdenawa* لێك جیاكردنەوە، لێك ترازاندن. دوبارە جدا كردن، عمل جدا كردن.

**جیاكریاگ**: *jiyâkeryâg* جیاكراو، هەڵبژێردراو. جدا شدە، دست چین شدە.

**جیاواز**: *jeyâwaz* تایبەت. متفاوت، جداگانە، ویژە، مخصوص. جیاكراو، جیاوەكراو.

**جیای**: *jiyâiy* جودای، وەكو (تۆجیای). دوری، مفارقت، مانند(تو جدایی).

**جیـای**: *jiyây* بەجـێگای، وەکـو (مـن لـە جیای تۆ). بـە جـای، درجـای، ماننـد (مـن بە جای تو).

**جیایی**: *jiyâi(i)* جودایی، دوور بوون. جدایی، دور بودن، مفارقت.

**جێ بـە جـێ**: *jēbajē* جـێگۆڕان. جـا بـە جا.

**جێت**: *jēt* جێگای تۆ. جایت، جای تو.

**جـــێدار**: *jēâr* جـــادار، نایـــب. جـــادار، جانشین، ("د". مهمله است).

**جیران**: *jeyrân* ناوێکە بۆ ئافرەتان. جیران، نامی زنانه.

**جیڕجـــــیڕە**: *jiŕjiŕa* جیرجیرۆکـــــە. جیرجیرك، یکی از انواع حشرات.

**جیزە**: *jiza* جۆرێ دەنگ، جووزە، نووزە. جیز، از اصوات، مانند (صدای سماور).

**جیقڵدان**: *jiqeĭdân* جیکڵدان. چینەدان مرغ، کنایە از میزان توانای فرد.

**جیکڵدان**: *jikeĭdân* جیقڵدان. چینەدان مرغ.

**جیکن**: *jiken* زۆر جووکن. جیك کننده.

**جێگۆڕکێ**: *jēgōŕekē* جێ گۆڕین. جا بە جایی، جای عوض کردن.

**جـێگە**: *jēga* جـێگا، جـێ خـەو. جـای، بستر.

**جێڵ**: *jēĭ* لاو، گەنج. جوان، کم سن.

**جیـڵ و جـوان**: *jēĭujwân* لاو، گـەنج. جوان، نوجوان، تازە جوان، کم سن و سال.

**جێماگ**: *jēmâg* جێماو، بە جێ ماو. جامانده، به جامانده.

**جـێماگی**: *jēmâgi* جـێماوی، بەجـێماو بوون، جێ ما بوون. به جا ماندگی، عقب افتادگی.

**جێوان**: *jēwân* جێوبان. رختخواب پیچ.

**جێوانن**: *jēwânen* لەقاندن، جووڵاندن. جنبانیدن، تکان دادن.

**جـــــێویاگ**: *jēwyâg* جووڵانـــــدراو. جنبانیده شده.

**جیە**: *jeya* جێگە، نۆین. بستر، جا، محل.

# چ

یەکێ لە پیتەکانی ئەلفوبێی کوردی.
یکی از حروف الفبا، پسوند تکرار.

**چاتمە**: *čâtma* دانیشتن لە سەر ئەژنۆ بۆ تیر هاویشتن، تەك دانی چەند تفەنگ بە شێوەیەك کە وەکو چادریك بنوێنن. قراول، چاتمه، به زانو نشستن، وضع و حالت، چند تفنگ که از قسمت لوله با هم متصل باشند و تشکیل یک خیمه بدهند.

**چاچۆڵەباز**: *čâčōĭabâz* فێڵباز. حیله گر، مکار.

**چاچە قولێ**: *čâčaqolē* خواردنی تایبەت بە منداڵان. اصطلاحی برای دست پخت بچه‌گانه.

**چاخ**: *čâx* ساز و تەیار، وەکو (قلیان چاخ کردن). مهیا، آماده، حاضر، مانند (قلیان آماده کردن).

**چاخ**: *čâx* قەڵەو، گۆشتن. چاق، پر گوشت، فربه.

**چاخان**: *čâxân* درۆ و دەلەسە، درۆی زۆر. چاخان، دروغ.

**چاخ و چل**: *čâxučel* زۆر قەڵەو. چاق و چله، فربه، پر گوشت.

**چاخەوبوون**: *čâxawbun* قەڵەوبوون، گۆشت گرتن، پەروار بوون. قەڵەو بوون، گۆشت گرتن، پەروار بوون. چاق شدن.

**چاخی**: *čâxi* زۆر گۆشتن، قەڵەوی. چاقی، پر گوشتی.

**چار**: *čâr* علاج. علاج، مداوا، درمان، از عهده برآمدن.

**چارشەو**: *čâršaw* چارشێو. چادر زنانه که زنان بر سر می کنند و تمام اندام را می پوشاند.

**چارقەو**: *čârqaw* چوار دەق، چارەکەی کۆڵ. چهار قد که بر کول می بندند، چهار قدف، چهارلا.

**چاركردن**: *čârkerden* چارەکرن، عیلاجکردن. علاج کردن، روبەراه کردن.

**چارگا**: *čârgâ* چادرگا، خێوەت گا، نێوی جێگایکە لە کێوی ئاویەر گەورە دا. چادرگاه، خیمه گاه، جایی در آبیدر بزرگ.

**چاروا**: *čârwâ* چارەوێ. چهار پا، ستور.

**چاروادار**: *čârwâdâr* کەسێ کە چارەویی بەخێو دەکا. کسی که کارش چهار پا داری بوده است.

**چارەك**: *čârak* یەك بەش لە چوار بەش لە کێشدا. واحد وزن برابر ۲۵۰ گرم.

**چارەك**: *čârak* ۱۵ دققە لە کاتژمێر. واحد زمان برابر یك ربع ساعت (۱۵ دقیقه).

**چارەك**: *čârak* پێوانەیەك بۆ ئەندازەگرتن بەرانبەر بە ۲۵سانتیمتر. واحد اندازەگیری برابر یك چهارم از متر ۲۵ سانتیمتر.

**چارەکە**: *čâraka* چارۆکە، چارۆك. چهارقد زنان که بر کول می بندند.

**چارەکێ:** *čârakē* یەك چارەك. یك ربع ساعت از زمان.

**چارەنووس:** *čâranus* ها، موقەدەر، بەسەرهات. سرنوشت، اشارە بە خداوند و مقدرات اوست.

**چاشت:** *čâšt* کاتی نێوان بەیانی و نێوەڕۆ. زمان بین صبح و ظهر، حد فاصل بین صبح و ظهر.

**چاشیاگ:** *čâšyâg* چەشراو. چشیدە شدە.

**چاڵ:** *čâĭ* قووڵێنە، چاڵ. چال، گود.

**چاڵان:** *čâĭân* چەشێ یاری لاوان و منداڵان. نوعی بازی محلی بین جوانان و نوجوانان.

**چاڵاو:** *čâĭâw* قووڵاییەکی نزم کە ئاوی تێدا کۆ دەبێتەوە. چالاب، گودی یا گودال حاوی آب.

**چاڵ کریاگ:** *čâĭkeryâg* چاڵ کراو. چال شدە، دفن شدە.

**چاڵ کەندن:** *čâĭkanden* چاڵ هەڵکەندن. چال کندن، گود کندن.

**چالوچۆڵ:** *čâĭučōĭ* جێگای زور چاڵدار، ناساف. چاە و چالە، فراز و نشیب، زمین ناهموار، پستی و بلندی.

**چاڵە:** *čâĭa* چاڵی بچووك. چالە.

**چاڵە قووتە:** *čâĭaquta* چاڵی قووڵ، چاڵی زۆر قوڵ. گودال کوچك.

**چاڵی:** *čâĭi* قووڵایی، قۆپاوی. گودی، منسوب بە گود.

**چان:** *čân* ئامێرێك كە لە كشتوكاڵدا بەكاردێ. خرمنكوب، یكی از آلات كشاورزی.

**چاو:** *čâw* دیە، وەکو (چاو خاس). چشم، دیدە، مانند (چشم خوب).

**چاو ئێشان:** *čâw ēšân* ژانی چاو، نەخۆشی چاو. چشم درد، درد ناشی از بیماری چشمی.

**چاوئێشە:** *čâw ēša* ژانی چاو. چشم درد ناشی از بیماری چشمی.

**چاوانە:** *čâwâna* بیری ئاوەڕۆ. چاە فاضلاب.

**چاوباز:** *čâwbâz* چاو شۆخ. شوخ چشم، خمار چشم.

**چاوبرسی:** *čâwbersi* پێچەوانەی چاوتێر. گرسنە، محتاج، نیازمند، هیزچشم.

**چاوبرین:** *čâwberín* لاساکردنەوە. چشم دوختن، نگاە کردن با دقت، چشم هم چشمی.

**چاوبۆق:** *čâwbōq* چاو دەرپەڕیو. کسی کە چشم او از حد معمول بیشتر برجستە باشد.

**چاوبەس:** *čâwbas* ئەوەی کەچاوی پێ ئەبەستن. چشم بند، نوعی غافلگیری.

**چاو بەستن:** *čâwbasten* چاو بەستن، چاو پۆشاندن، ئاماژەیە بۆ فریو دان. چشم بستن، اصطلاحی کنایەای از فریب دادن.

**چاو پۆشان:** *čâwpōšân* رابووردن، چاو بەستن. چشم پوشاندن، گذشت کردن.

**چاوپۆشـــــین**: *čâwpōšin* لێبـــووردن. چشم پوشیدن،گذشت کردن، صرف نظر کردن از تقصیر.

**چاوترسیاگ**: *čâwtersyâg* چاوترساو. ترسیده چشم، ترسیده، زهر چشم گرفتـه شده.

**چاوترسین**: *čâwtersin* ترساندن. چشم ترسان، زهر چشم.

**چـــــاوترووکاندن**: *čâwterukânden* پێڵوو لەسـەر یـەك نـان. پلـك بـرهم زدن متوالی.

**چـاوترووکانن**: *čâwterukânen* خێـرا داخـستن و کردنــەوەی پێڵـوی چـاو. پلـك برهم زدن متوالی.

**چاوترووکانێ**: *čâwterukânēk* کاتێکی زۆر کـورت. یــک چـــشم بـــرهم زدنـــی، لحظەای، آنی، دمی.

**چـــــــاوترەکاندن**: *čâwterakânden* چاوکردنەوە. چشم ترکانیدن.

**چـــاوترەکانن**: *čâwterakânen* چـــاو تروکاندن، چاوکردنەوە. چشم بازکردن.

**چـاوتەنگ**: *čâwtang* رژد. چشم تنگ، صفت خسیس.

**چاوتەنگی**: *čâwtangi* رژدی. خسیسی.

**چاوتیژ**: *čâwtiž* کەسێ کە سۆمای چاوی زۆرە. تیز چشم، تیزبین.

**چاوچڵە**: *čâwčeĭa* چاوزار. چشم زخم.

**چاوچڵـــێس**: *čâwčeĭes* چاوچــــنۆك، چاوحیز. چشم چران، نظرباز.

**چاوچنۆك**: *čâwčenōk* نەزەر باز، رژد. چشم چران، نظربـاز، حــریص، آزمنــد، حسود.

**چاوحیز**: *čâwĥiz* نەزەرباز. چشم هیز، نظرباز.

**چــــــــاخەوکردن**: *čâwxawkerden* قەڵەوکردن، پەروارکردن. پروار کردن.

**چـــاو داخـــستن**: *čâwdâxesten* ســـەر بەخوار کردن، شـەرم کـردن. ســربە زیــر آوردن از شرم، صرف نظر کردن.

**چاوڕشـتن**: *čâwŕešten* سورمەکێـشان. سرمه کشیدن چشم.

**چاوڕۆشـنی**: *čâwŕōšeni* دیـتنی کەسـێ کە ئارەزووی دەکرا، پێشکەشیدان بە هۆی دیتنی دووبارە. چشم روشنی.

**چاو ڕەش**: *čâwŕaš* ها، شۆخ چاو. چشم سیاه، سیاه چشم.

**چـــاوزاق**: *čâwzâq* چـــاو زەق، چـــاو دەرپەڕیو. چشم از حد فه درآمـده، چـشم بزرگ، حالتی از چشم در خیرگی.

**چـاو ســەوز**: *čâwsaōz* چـاو کەسـك. چشم سبز.

**چاو فڕین**: *čâwfeŕin* چاو تروکان. تیك زدن چشم.

**چـــاو قرتـــانن**: *čâwqeŕtânen* چـــاو قراندن. چشمك زدن، پلك برهم زدن.

**چـاو قووچـانن**: *čâwqučânen* چـاو نووقاندن. چشم برهم زدن.

**چـاوکاڵ**: *čâwkâĭ* چـاو بـە ڕەنگـی زەرد، چاو زەرد. کسی کە چشمانی بـە رنـگ زرد داشته باشد.

**چاوكردنەوە:** *čâwkedenawa* سەرنجدادن. چشم باز كردن و خوب ديدن، دقت كردن.

**چاوكە:** *čâwka* سەرچاوە، كانى. چشمە، سرمنشاد، عامل.

**چاو كەژاڵ:** *čâwkažâĭ* چاو بە ڕەنگى ڕەشى مەيلەوشين، وەكو (ڕەنگى چاوى ئاسك). نوعى رنگ سياه مايل به آبى، مانند(رنگ چشم آهو)

**چاوگەر:** *čâwgar* چاوان، چاوەكان، چاوگەل. چشم ها، چشمان.

**چاڵاو:** *čâĭâw* قووڵاييەكى نزم كە ئاوى تێدا كۆ دەبێتەوە. چالاب، گودى يا گودال حاوى آب.

**چاولكان:** *čâwlekân* دەمێ، كاتێكى كورت، چاو بەيەكانانێ. چشم بر هم زدن، آنى، زمانى كوتاه.

**چاولكياگ:** *čâwlekyâg* چاو لكاو. چشم بسته، بيمارى چشم كه بر اثر عفونت آن پلک‌ها به هم چسبيده مى شود.

**چاو لێبڕين:** *čâwĭeberin* لاساييكردن. چشم بريدن، تقليد كردن.

**چاو لێدان:** *čâwĭedân* چاو زاركردن. چشم زخم زدن.

**چاولێگەرى:** *čâwlēgari* لاساكردنەوە. چشم هم چشمى.

**چاوماسياگ:** *čâwmâsyâg* چاو پەناماو، چاو ماسراو، چاوپەنەميو. كسى كه چشم هاى او ورم كرده باشد.

**چاومەس:** *čâwmas* چاومەست، چاو خومار. شوخ چشم، خمار چشم.

**چاوەچاو:** *čâwačâw* دڵەودوا، نيگەران، چاوگەڕاندن بە شێون كەسێ يا شتێ. چشم انتظارى، با دقت نگريستن براى يافتن كسى يا چيزى.

**چاوەڕوانى:** *čâwaŕewâni* چاوەڕێى. چشم انتظارى.

**چاوەڕێ:** *čâwaŕē* چاو لە ڕێ، چاوەڕوان. چشم به راه، چشم انتظار.

**چاوەڕێگە:** *čâwaŕēga* چاو لە ڕێگە، چاوەڕوان، ماتڵ. چشم به راه، چشم انتظار.

**چاوشارەكێ:** *čâwšârakē* يارييەكى منداڵان كە چاو دەبەستن. قايم موشك بازى، يكى از انواع بازى‌هاى كودكان.

چاوەقووڵە: *čâwaquĭa* چاو قووڵكە بە هۆى ناخۆشييەكى تايبەتەوە. گرد شدن چشم‌ها ناشى از عارضەى بيمارى وبا و اسهال و استفراغ.

**چاوهەڵتەكانن:** *čâwhaĭtakânen* هێماكردن بە چاو، ئاماژەكردن بە نەهێنى. اشارەكردن با چشم و ابرو براى اداى كلمه نه.

**چايگ:** *čâig* سارد، وەكو (ئاوەكە چايگ بوو). سرد، خنك، مانند (آن آب سرد بود).

**چايگەوبوون:** *čâigawbun* ساردەوەبوون. خنك شدن، سرد شدن.

**چايگەوچايگ:** *čâigawčâig* سارد بە ساردى. سرد سرد.

**چایگی**: *čâigi* ساردی. سردی، خنکی.
**چایمان**: *čâymân* سەرما خواردن. سرما خوردگی عضلات.
**چایمانی**: *čâymâni* نەخۆشیی ئەندام بەهۆی سەرماوە، پەتا. سرما خوردگی عضلات.
**چایی**: *čâi(i)* چا. چای، یکی از انواع گیاهان که دم کرده آن مصرف خوراکی دارد.
**چپە**: *čepa* پچە، سرتە، ورتە. پچ، درگوشی صحبت کردن.
**چپە چپ**: *čepačep* سرتە سرت، ورتە ورت، پچە پچ. پچ پچ، در گوشی متوالی.
**چت**: *čet* شت. چیز، شئ.
**چت و مت**: *četumet* شت و مت. چیز میز، چیزها، اشیا مختلف.
**چتوور**: *četur* بزنی دووسالان. بز دو ساله.
**چتێك**: *četēk* شتێك. چیزی، شئ، وسیلەای.
**چرا**: *čerâ* چرا. چراغ.
**چرا ئینگلیسی**: *čerâ ingelisi* جۆری چرای دەستی، چرای فانۆس. چراغ فانوس.
**چرا بەرق**: *čerâbarq* چرای کارەبا. چراغ برق، چراغی کە با نیروی الکتریسیتە و برق کار کند.
**چراتۆڕی**: *čerâtōři* چرای تۆڕدار بۆ رووناکایی. چراغ توری، نوعی چراغ نفتی تلمبەای پر نورتر از سایر چراغ های مشابە، چراغ زنبوری نیز بە آن گفتە می شود.
**چراخان**: *čerâxân* چرا هەڵکردن بۆ شایی. چراغان، روشن کردن چراغ های متعدد.
**چراخانی**: *čerâxâni* چراخان کردن. چراغانی، روشن کردن چراغ های متعدد برای مراسم جشن و سرور.
**چرادار**: *čerâdâr* خاوەن چرا، فەرمانبەری شارەوانی و بەرپرسی رۆشن کردنەوەی چراکانی شار بووە. چراغدار، کسی کە مأمور روشن کردن چراغ باشد کەدر قدیم شهرداریهادرمعابر عمومی مأمورینی برای این کار داشتند.
**چرادان**: *čerâdân* جێ چرا، چرا دانن، عەلامەت لێدان بە چرا. چراغ دادن، علامت دادن با چراغ، کنایە از آری گفتن، جای چراغ.
**چرا دەسی**: *čerâdasi* چرای دەستی بۆ رووناکایی. چراغ دستی، چراغ کوچك روشنایی.
**چرا رۆشن**: *čerârōšen* زاراوەیەکە بە مانای شەو بەخێر. در اصطلاح بە معنای شب بخیر است.
**چرا ساز**: *čerâsâz* کەسێك کە پێشەی چراسازیە. چراغ ساز.
**چرا فرۆش**: *čerâferōš* ئەوەی کە چرا دەفرۆشێ. چراغ فروش، کسی کە شغل او فروش چراغ است.

**چرا قوه:** *čerâqwa* لایت، چرای دەستی که به باتری کار دەکا. چراغ قوه، چراغ باتری دار.

**چـراکار:** *čerâkâr* چـرای تایبـەت بـه ئیش و کار. چراغ کار، چـراغ مخـصوص کار پیشه وران.

**چـراکان:** *čerâkân* ئاماژەیـه بـۆ چـەن چرا، چرا گەل. چراغ ها.

**چــرا کــردن:** *čerâkerden* چــرا داگیرساندن، کاتی تایبەت به چرا کردن وەکو ئـێواران. چـراغ روشـن کـردن، زمـان چراغ روشن کردن.

**چراکه:** *čerâka* ئاماژەیه بۆ یەك چـرا، ئەوچرا. آن چراغ، چراغ مورد نظر.

**چرا لامپا:** *čerâlâmpâ* چرای گڵۆپدار. چراغی مخصوص روشنایی در اتاق.

**چرا مووشی:** *čerâmuši* چـرای دەسـتی بێ شووشه. چراغ بـدون شیـشه نفـتی کـه دارای فتیله و پایه است.

**چـرا نـەفتی:** *čerânafti* چـرا نـەوتی. چراغ نفتی که با نفت می سوزد.

**چــرای مــاڵ:** *čerâymâĺ* ئاماژەیــه بۆگەورەی ماڵ. چراغ خانه، کنایه از کسی که عزیز خانه است.

**چـرنه:** *čeŕna* کۆنـه و دڕاو پـۆش. بـد لباس، ژنده.

**چرکه:** *čerka* له دەنگەکان، دققه. صـدای حرکـت ضـعیف، تیـر کـشیدن ضعیف درد، واحد زمانی برابر با ۱ دقیقه.

**چــرنەوپرنه:** *čeŕnawpeŕna* بــه هەرزەگـەرد و خوێـڕی دەوتـرێ، مانـای شـڕوپڕ لـه بەرێـچ دەدا. اصــطلاحی کنایەای از تعـدادی آدم ولگـرد و ژنـده مندرس پوش، اراذل و اوباش.

**چرۆ:** *čerō* خونچه و لقی تـازەی گوڵ و دار. جوانه درخت بر شاخه.

**چرۆ:** *čerō* لەوەڕین. چرا، چریدن

**چـڕوپڕ:** *čeŕupeŕ* تێروتەسـەل، پـڕ و پۆشته. به اندازه کافی.

**چـڕیاگ:** *čeŕyâ* بـڕاو، بـڕدراو، بـچڕاو. پاره شده، مندرس.

**چڕیاگ:** *čeŕyâg* بانگ کـراو، خواسـتراو، بانگهێش کـراو. خواسـته شـده، احـضار شده.

**چریکه:** *čerika* دەنگێکی دڵڕفێن وەکو دەنگی مۆسیقا یـان بولبـوڵ. صـدای آواز خوش، صدای گوش نواز.

**چـڕین:** *čeŕin* بـچڕاندن. گسـستن، پـاره کردن.

**چــڕین:** *čeŕin* بــانگ لـێکردن. بــانگ کردن، خواستن فردی، ندا دردادن.

**چڕین:** *čeŕin* بانگ کردن، بانگ هێشتن. خواستن، بانگ کردن، ندا در دادن، آواز.

**چز:** *čez* ها، وەکو چزی مار و دووپشك. نیش مانند، نیش مار یا زنبور.

**چزانن:** *čezânen* داخکردن. نیش زدن، داغ کردن کنایه از کلك خورده.

**چـزڵیك:** *čezĭik* دووگی بـرژراو. دنبـه سرخ شده در تابه.

**چزه:** *čeza* ها. آثار نیش.

**چزه چز**: *čezačez* جزجز، له دەنگەکان وەکو دەنگی تاواندنـەوەی ڕۆن. از اصوات، صدای روغن گداخته.

**چزیا**: *čezyâ* چـزراو. نـیش زده شـده، کنایه از آدمی که شکست خورده یا سـر او کلاه گذاشته شده.

**چزیاگ**: *čezyâg* چزراو، چزاو، گەسراو. جز شده، نیش زده شده.

**چش**: *češ* چاو لێ پۆشین. صـرف نظـر کردن، از اصوات کنایەای به جهّنم.

**چـشه**: *češa* وشـەی لـێخوڕینی کـەر و هێستر. نهیب به الاغ و چهار پایان بارکش برای حرکت کردن سریع.

**چـفت**: *čeft* کپ، وەکـو (درگاکـه چـفت کـه). بـست، چـفت، ماننـد (درب را چـفت کن).

**چفت بوون**: *čeftbun* کپ بوون.

کپ شدن، چفت شدن.

**چـفت کریـاگ**: *čeftkeryâg* بەسـتراو، چفت کراو. کپ شده، چفت شده.

**چـق و نـر**: *čequneŕ* چـناکەدان لـه نرخدا، چەنەدان، زۆرلێدان. چانه زدن در کار خرید و فروش، زور زدن زیاد.

**چق و نر**: *čequneŕ* تێکوشانی زۆرتر له ڕاده. زحمت، تلاش زیاد و خارج از توان.

**چل**: *čel* ژمارەی چل. عدد چهل ۴۰.

**چـڵ**: *čeĺ* چـڵ و لقـێك لـه دار. شـاخه درخت.

**چڵ**: *čeĺ* ژانـی بـرین. تـیر کـشیدن محـل دردناك ناشـی از زخـم یـا بیمـاری، سـوز و درد متناوب.

**چلانن**: *čelânen* گووشینی کووتاڵی تەڕ یان هەر شتێکی تر. آب گرفتن، چلاندن.

**چـڵاو**: *čeĺâw* پـڵاو، برنجـی ئاوکێـشی کـراو. چلو، برنج که بـه صـورت آبکـش طبخ می کنند.

**چڵاوخوەرشـــــت**: *čeĺâwxwarešt* خۆراکـێکی بـەناوبـانگ لـه خۆراکـه ئـێرانییەکان. چلوخورشـت، از غـذاهای سنتی ایرانی.

**چڵپاو**: *čeĺpâw* گەناوە، وەکو (کتەك ناو چڵپاو). گندآب، آب راکد و آلوده.

**چـڵپ و لـێس**: *čeĺpulēs* دەنگـی ئـاو خواردنـەوەی سـەگ، لفت و لیس. لـیس زدن حریصانه.

**چڵپه**: *čeĺpa* دەنگی دەست کوتان له ئاو، دەنگـی خواردنـەوەی بـه پەلـه. صـــدای آب(چلپ)، صدای آشامیدنی که با عجله سرکشیده شود.

**چـــڵپه چـــڵپ**: *čeĺpačeĺp* دەنگـــی خواردنەوە به پەله خواردن. از اصـوات، چلپ چلپ کردن در آشامیدن.

**چل تیکه**: *čeltika* پارچەی چل تیکه. چهل تکه پارچه که از تکه های رنگارنگ به هم دوخته باشند.

**چلچرا**: *čelčerâ* چل دانه چرا پێکەوە. چهل چراغ.

**چلـچەمه**: *čelčama* نـێوی چـیایەکی بـەرز و سـەرکەش. چـهل چـشمه، کـوهی بلند و رفیع در کردستان.

**چـڵك**: *čeĭk* زووخـی بـرین. مـاده سـفید رنگی که از زخم تراوش کند، مـاده چـرب و تیره روی لباس و بدن.

**چڵكاو**: *čeĭkâw* ئاوی پیس. گنـد آب، آب مانده، آب چرك.

**چڵكاوخوەر**: *čeĭkâwxwar* چـڵكاوخۆر، پیس خۆر. کنایه از آدم پس مانـده خـوار و خدمتکار.

**چڵكدار**: *čeĭkdâr* چـڵكن. چـركی، آلـوده به چرك.

**چڵكن**: *čeĭken* پیس. چــركین، كثیــف، آلوده به چرک.

**چڵكی**: *čeĭki* چـڵكن. چركی، آلــوده بــه چرک، کثیف.

**چــڵم**: *čeĭm* ئــاوی خەســتی لــووت. آب دماغ، عفونت دماغ، چلم.

**چـڵم شـۆڕ**: *čeĭmšōŕ* كەسـێ كـە ئـاوی لووتی بێتە خـوارەوە. عن دماغی، کنایــه از آدم بی نظم و دست و پا چلفتی.

**چڵمن**: *čeĭmen* ئەوەی كە ئاوی خەستی لـووتی هەیـە. کـسی کـه عفونـت دمـاغی دارد.

**چڵمنە**: *čeĭmena* ئەوەی كـە زۆر ئـاوی لـووتی هەبێ، كەسـێ كـە چـڵمی شـۆڕ بـێ. چلمو، عن دماغی.

**چلۆن**: *čelōn* چۆن. چگونه، چطور.

**چڵوچــێو**: *čeĭučew* لقوپـــۆی وشــك. خــرده چــوب، شــاخەهای نــازك چــوب درختان خشك.

**چـڵ وەشـانن**: *čeĭwašânen* ژانكردنـی بـەینا بـەین. تیر كشیدن محل زخــم یــا عارضه.

**چله**: *čela* شەوی زستان، رەسـم و یاسـای رۆژی چل بە هۆی مەرگی ئازیزێ. چهلم، چهلمین روز پـس از مـرگ عزیـزان، شـب اول زمستان، شب یلدا.

**چله بووچك**: *čelabuček* چله بچووك، بیـست رۆژ دوای چـلە گـەورە. بیـست روز بعد از پایان چله بزرگ.

(نگاه چله گەورە).

**چڵە پۆپـە**: *čeĭapōpa* سـەر لـەق، سـەر چڵ. سر شاخه درخت.

**چڵەچـڵ**: *čeĭačeĭ* ژانــی پـەیتا پـەیتای برین. سوز ممتد درد، تیر کشیدن ناشی از درد.

**چڵەكیاگ**: *čeĭakyâg* پەشۆكاو، چڵەكاو، سڵكراو. هول شده از یك رویداد ناگهانی.

**چــڵەكیان**: *čeĭakyân* پەشـۆكیان، ســڵ كردنــەوە. هــول شــدن از یــك رویــداد ناگهانی.

**چلەكـێش**: *čelakčēš* ریازەتكێـشان بـە ماوەی چل رۆژ، كەسێك كە چلە دەكێشی. چله كشی، كــسی كــه چهــل روز تمــام بدون طعام تنها با چهــل عــدد خرمــا و کمی آب ریاضت کند.

**چــــڵەكین**: *čeĭakin* ســــڵكردنەوە، پەشـۆكیان. هـول شـدن از یـك رویـداد ناگهانی.

**چله گەورە:** *čelagawra* شەوی هەوەڵی زستان. شب اول از فصل زمستان، شب یلدا.

**چڵەوکەواو:** *čeĭawkawâw* کەباب و پلاو. چلوکباب، برنج دم کرده و کباب که از غذاهای سنتی است.

**چل هەزار:** *čelhazâr* چل هەزار. چهل هزار.

**چڵێ:** *čeĭē* شاخەای، لقێ، یەك چڵ. شاخەای، یك شاخه.

**چلیاگ:** *čelyâg* گوشراو، ئاوچن کراو. چکیده شده، آب گرفته شده.

**چڵێس:** *čeĭēs* زکە ڕۆ. شکمو، حریص.

**چڵێسی:** *čeĭēsi* زکەرۆی. شکمویی، حریص بودن.

**چڵێك:** *čeĭek* لقێك، یەك چڵ. شاخەای، یك شاخه.

**چلین:** *čelin* گووشین بۆ ئاو گرتن. چکانیدن، آب گرفتن، چلیدن.

**چما:** *čemâ* تومەز، تۆبڵێ. توگویی، مثل اینکه.

**چما بووگە:** *čemâbuga* وەکو شتێ بووە. با این تصور که بوده است.

**چما وتت:** *čemâwetet* تومەز وتت. با این تصور که شما گفتی.

**چمچە:** *čemča* کەوچووی گەورە، کەوچکی گەورە. نوعی قاشق بزرگ چوبی دسته بلند.

**چمچە:** *čemča* چەشنێك کەوش کە لە پێ دەکرا، چەشنێ پێڵاو. نوعی از کفش و پای افزار که در قدیم می پوشیدند.

**چنار:** *čenâr* داری چنار. درخت چنار، از درختان بدون میوه و پر شاخ و برگ و بلند، چوب آن مصرف صنعتی دارد.

**چناکە:** *čenâka* چناگە، چەنە. چانە، زنخدان.

**چناکە دان:** *čenâkadân* چەنە دان، زۆر بڵێ. وراجی کردن، چانه زدن.

**چناکە شکیاگ:** *čenâkašekyâg* چناگە شکاو، زۆربڵێ. چانه شکسته، اصطلاحی کنایەای از آدم وراج.

**چنگ:** *čeng* دەست و پەنجە، پەنجە. چنگ، مجموعه کف دست و انگشتان.

**چنگاڵ:** *čengâĭ* هاوتای کەوچك. چنگال مخصوص غذا خوردن.

**چنگ کەفتن:** *čengkaften* دەست کەوتن. به چنگ انداختن، به دست آمدن.

**چنگگرتن:** *čenggerten* پنجەگرتن. چنگ زدن، خراش دادن با ناخن.

**چنگە پرچێ:** *čengaperčē* چنگ کوتان. چنگ زدن برای رهایی.

**چنگە سەرێ:** *čengasarē* لە سەر دان، چنگ لە سەر گرتن. سرزنش کردن، چنگ گرفتن از سر.

**چنگە فلێقێ:** *čengafelēqē* پەنجە کێشان بۆ فلێقاندن، فلێقاندن بە پەنجە. له کردن با دست، چنگ زدن برای له کردن.

**چنگە کڕکێ:** *čengakeŕkē* چنگە پرچێ. چنگ انداختن.

**چنگێ گۆشت**: *čengēgōšt* ئاماژەیە بۆ مرۆڤی لاواز. یەک مشت گوشت، اصطلاحی کنایەای کە بە آدم لاغر و ریز اطلاق می گردد.

**چنگێ مـوو**: *čengēmu* نەختێ مـوو، مشتێ موو. یك مـشت مـو، بـه انـدازه یـك مشت و کف دست مو.

**چنۆك**: *čenōk* رژد. آزمند، حریص.

**چـنۆکی**: *čenōki* رژدی. آزمنـدی، حریصی.

**چنین**: *čenin* ها، هۆنینەنەوە. بافتن.

**چـنیاگ**: *čenyâg* چـنراو. چـیده شـده، بافته شده.

**چوار**: *čwâr* ژماره ۴. عدد ۴.

**چـوارباخ**: *čwârbâx* نـێوی گەڕەکـێکی شـاری سـنەیە. چـهار بـاغ، نـام محلـەای قدیمی در شهر سنندج.

چوار پاچکە: *čwârpâčka* چوار پایەی کورسی. چهار دست و پا، چهار پایه.

**چـوار تـاك**: *čwârtâk* ئـاوەلا، تـەواو ئاوەڵا. درب تمام باز.

**چوارخانە**: *čwârxâna* چـوار خـشتەای دوو ڕەنگ. چهار خانه، شطرنجی.

**چوارچرا**: *čwârčerâ* نێوی مەیدانـێکە له سابلاغ. چهار چـراغ، نـام میـدانی اسـت در مهاباد.

چوار چنگە: *čwârčenga* ها. چهار چنگولی.

**چـوار چـەقەڵ**: *čwârčaqaĭ* چـوار هەنگەڵ. چهار دست و پا، تاقباز.

**چوارچـێو**: *čwârčēw* هـا، چـوار داری کـەناری قـاپ یـان دەرگـا و... چهار چوب، چهار چوبه.

**چـوار ڕێـگان**: *čwârŕēgân* هـا، چـار ڕییان. چهار راه، چهار سوق.

**چوارسـووچ**: *čwârsuč* قـوژبن، چـوار گۆشە. چهار کنج، چهار گوشه.

**چوارشـەمە**: *čwâršama* رۆژی چوارشەمە. روز چهارشنبه.

**چوارشەمە سووری**: *čwâršamasurē* چوارشەمە کوڵێ، روژی چوارشەمەی ئاخری ساڵ. چهارشنبه سوری، مراسم روز چهارشنبه آخر سال.

**چـوار فەسـڵ**: *čwârfaseĭ* چـوار وەرزە. چهارفصل.

**چوار فەسڵە**: *čwârfasĭa* چوار وەرزە. چهارفصل.

**چوار قەو**: *čwârqaw* چوار قەد. چهار قد، چهار تا.

**چـوارلان**: *čwârlân* چـوار گوشـە، چـوار سووچ. چهار جانب، چهار طرف.

**چـوار مـشقی**: *čwârmešqi* چـوار مەشقان. چهار زانو، حـالتی از نشـستن کـه پاها را جمع می کنند.

**چـوار مـێخ**: *čwârmēx* چـوار بزمـار، چوار مێخ کێشاندن. چهار میخ.

**چـوار هـەزار**: *čwârhazâr* هـا. چـهار هزار.

**چواری**: *čwâri* چوار کەسی. چهار تـایی، چهار نفری.

**چۆپی**: *čōpi* هەڵپەڕکێ، دیلان. چوپــی، رقص کردی که به صورت دسته جمعــی اجرا می‌گردد.

**چۆپیکێش**: *čōpikēš* ها، هەڵپەڕکێکەر، سەماکەر. رهبر و نظم دهنده رقص دسته جمعــی کُردی، رقصنده رقص کردی.

**چۆخ**: *čōx* چوق، چۆڕی ئاخر.
آخرین قطره، آخرین جرعه.

**چۆڕ**: *čōŕ* دڵۆپ، وەکو (چۆڕ ئاو).
قطره، شر، مانند(قطره آب).

**چۆڕاو**: *čōŕâw* دڵۆپ ئاو تکاو.
آب چکیده.

**چۆڕاوگە**: *čōŕâwga* کانیاوی کەم ئاو.
چشمه‌ای که آب کم و قطره قطره داشته باشد.

**چۆڕاوە**: *čōŕâwa* دڵۆپە ئاو.
قطرات آب.

**چۆڕانن**: *čōŕânen* چۆڕاندن.
قطرات آب در حال ریختن.

**چورت**: *čort* سەرخەو، نوچ.
چُرت، حالتی بین خواب و بیداری.

**چـورت**: *čort* چـورتکە، ئـامێری حیـساب کردن. چُرتکه، وسیله حساب کـه از چـند میله و گوی گـرد تـشکیل شـده و بـه جـای ماشین حساب از آن استفاده می شد.

**چۆڕە**: *čōŕa* دڵۆپە، شۆڕاوە. شُر شُرآب یا مایعات مشابه.

**چـۆڕە چـۆڕ**: *čōŕačōŕ* دڵۆپــە دڵـۆپ، چۆڕچۆڕ. قطره قطره، شر شر.

**چۆڕێ**: *čōŕē* دڵۆپێ، بریتی له کەمێ ئاو.
قطره‌ای، جرعه‌ای.

**چۆڕیان**: *čōŕyân* ئاو دەڵێن، ئاوی دڵۆپ دڵۆپ.
شُر شُر آمدن.

**چـۆڕیك**: *čōŕek* دڵۆپــێك. قطـــره‌ای، جرعه‌ای از یک مایع.

**چوسی**: *čosi* رژد. چُسی، خسیس.

**چـۆق**: *čōq* لـەرز. لــرز، عکــس‌العمــل طبیعی بدن در برابر بیماری.

**چۆق**: *čōq* دوایین دڵۆپ. آخرین قطــره، قطره آخر.

**چۆك**: *čōk* ئەژنۆ، زرانی، به سـەر ئـەژنۆ دانیشتن. زانو.

**چۆکڵە**: *čōkĭa* چـیلکەدار. تراشه چوب، قطعه چوب نازک.

**چـۆکایی**: *čōkâi(i)* بـە سـەر چـۆکدا دانشتن. حالت خم شدن زانو.

**چــۆکدان**: *čōkdân* بــە ســەر چــۆك نشستن.چمباتمه زدن.

**چــۆکڵە گــۆرد**: *čōkĭagōrd* چــیلکه شقارته.چوب کبریت.

**چـۆکڵە قنگـە**: *čōkĭaqenga* چـۆکڵە، چەشنی جرە (مـێروو) کـە دوویـی درێـژی هەیـە. سـنجاقك، نـوعی حـشره کـه دارای تنـه باریـك و کـشیده بـا چهار بـال نـازك است.

**چۆکەرە**: *čōkara* چەکەرە، جوانە.
محصولات جالیزی مانند پیاز یـا ســیب زمینی.

**چــۆڵ**: *čōĭ* دژی دایــر، وەکــو (چــۆڵ کریاگ). خلوت، خالی، مانند (خلوت شـده است).

**چـۆڵایی**: *čōĭâi(i)* دژی ئـاوەدانی، جـێ چۆڵ. جای خلوت و دنج.

**چـۆڵبووگ**: *čōĭbug* چـۆڵکراو. خـالی شده.

**چۆڵ کریاگ**: *čōĭkeryâg* چۆڵ کراو. خالی شده.

**چـــۆڵ و هـــۆڵ**: *čōĭuhōĭ* زۆر چـــۆڵ. خلوت، خالی از هر جنبنده و صدا.

**چـۆڵە چـرا**: *čōĭačerâ* جـێگای چـۆڵ و بێ رووناکایی. جای بـدون نـور و چـراغ و روشنایی.

**چۆڵە ڕێ**: *čōĭaŕē* ڕێگای بێ هاتوچۆ. کوره راه، راه خلوت.

**چۆڵی**: *čōĭi* بێ ئاوەدانی. خلوتگاه، جـای خلوت و آرام.

**چۆن**: *čōn* چلون، به چه شێوه. چطـور، چگونه، چون.

**چۆناوچۆن**: *čōnâwčōn* چلونایەتی. چندوچون، چگونگی.

**چـــۆنکو**: *čōnku* بـــەڵام چـــۆن. زیـــرا، چونکه.

**چـــۆنکە**: *čōnka* بۆیـــە، وەکـــو (چـــۆنکە رویگن منیش ئەڕۆم). زیرا، به این سـبب، ماننـد(چـون کـه آنهـا رفتنـد مـن هـم مـی روم).

**چـۆنکێ**: *čōnkē* بۆیــە. زیــرا، بــە ایــن سبب.

**چۆنەر**: *čōnar* چەوەندەر. چغندر، لبـو، گیـــاهی از تیـــره اســـفناجیان بـــا بـرگهـای پهن، بیخ آن درشت است و سه نـوع اسـت: رسمی، شیرین و قندی.

**چۆنەرین**: *čōnarin* چەوەندەری کوڵاو. چغندر پخته که مصرف غذایی دارد.

**چۆن یەك**: *čōnyak* وەکو یـەك. یکسان، برابر، مشابه.

**چـــۆوار**: *čōwâr* کەســـێك کـــە پیـــشەی چۆواری بێ. کسی کـه شـغل او چوبداری باشد.

**چـۆواری**: *čōwâri* ئـاژەڵ کـڕ و ئـاژەڵ فـرۆش. چوبداری، کسی کـه بـا خریـد و فروش دام امرار معاش می کند.

**چـــووزان**: *čuzân* نـــێوی یارییەکـــە تـــا رادەیەك وەکو شەترەنج وایـە. نوعی بازی و سرگرمی که بین دو نفر یا بیشتر انجام می گیرد.

**چووزەرە**: *čuzara* چۆکەرە. جوانه تـازه سر زده.

**چووم**: *čum* ڕۆیشتم، وەکـو (مـن چـووم بـــۆ ســـەر کـــار). رفـــتم، ماننـــد (مـــن سرکاررفتم).

**چوون**: *čun* ڕۆیشتن، رابووردن، گەڕانەوە بۆ ئەوێ. رفتند، گذشتند، عبور کردنـد، بازگشتند.

**چوونان**: *čunân* ئەگەر ببێ، چەنان. چونان، چون ها.

**چوونە ژێر**: *čunažēr* داننان، ژێرگرتن، قوبـوولکردنی مەبەسـتێ. بـە زیـررفتن، اعتراف کردن، زیر بار رفتن.

**چوونەوە**: *čunawa* ڕۆیشتنەوە. دوبـاره رفتند، دوباره بازگشتند.

**چەپاڵە**: *čapâĭa* چەپۆك. سیلی زدن با کف دست برصورت، پنجە کشیدن برای برداشتن چیزی با عجلە.

**چەپاو**: *čapâw* غارەت. چپاول، غارت.

**چەپك**: *čapk* دەستە، وەکو (چەپکێ گوڵ). یك دستە، مانند(یك دستە گل یا مشابە همین).

**چەپکە**: *čapka* دەستە، وەکو (چەپکەی گوڵ). یك دستە، مانند (یك دستە گل).

**چەپگەرد**: *čapgard* ئاماژەیە بۆ بە دڵ نەگەرانی ژیان، ئاماژە بۆ دەور و زەمانە. چپ گرد، کنایە از دور زمانە کە مخالف میگردد.

**چەپڵە**: *čapĭa* لێکدانی دوو دەست. کف زدن، کف، دست.

**چەپلەر**: *čaplar* کەسێ کە کار بەدەستی چەپ دەکا. چپ دست.

**چەپڵەڕێزان**: *čapĭaŕēzân* چەپڵە کوتان بە کۆمەڵ. کف زدن جمعی.

**چەپ لێدان**: *čaplēdân* چەپڵە لێدان. کف زدن برای ابراز شادی و رضایت.

**چەپوانە**: *čapwâna* پێچەوانە. وارونە، برعکس، پشت و رو.

**چەپۆکە**: *čapōka* چەپۆك. توسری، قسمت مچ تا کف دست.

**چەپۆکە سەرێ**: *čapōkasarē* چەپۆك لێدان، لۆمەکردن، لە سەر کوتانن بە چەپۆك. توسری، سرزنش، سرکوفت.

**چەپوڕاس**: *čapuŕâs* راست و چەپ. چپ و راست، اطراف، جوانب.

**چەپۆڵ**: *čapōĭ* تێسمیڕاوی گێژ. درشت هیکل و بی خاصیت.

**چەپە**: *čapa* هەڵگەڕاو، سەرنخوون، چەپەکردن. واژگون، چپ، چپ کردن.

**چەپەربەن**: *čaparban* ملپێچ لەموورو دراوی ئاڵتونی، شال پارچەی. نوعی زیور آلات کە چپ و راست بە دور سینە کودك میبستند، پارچە شال مانندی کە چپ و راست بە سینە می بندند و از پشت گره می زنند.

**چەپەڵ**: *čapaĭ* پیس. کثیف، آلودە، چرکین.

**چەپەڵی**: *čapaĭi* پیسی. کثافت، مدفوع.

**چەتان**: *čatân* نێوی گوندێکە. نام روستایی.

**چەتر**: *čater* شتێ کە بۆ خۆم پاراستن لە تەڕبوونی لە کاتی باران و بەفردا لەسەر سەر هەڵدەدرێ. چتر.

**چەتوون**: *čatun* زۆرناهاڵ، بێ باك و نەترس و زرەنگ. بی پروا، جسور.

**چەتوەر**: *čatwar* ۱/۴ لە یەك بتڵ خواردنەوە. چتول، یک ربع از بطری.

**چەتە**: *čata* چیتە. چە مشکلی داری، چە کاری داری، چیە.

**چەتە**: *čata* ڕێگر، تاڵانچی. راهزن، یاغی شورشی، باجگیر، گردنە گیر.

**چەتەگەری**: *čatagari* ڕێگری. کسی کە بە راهزنی مشغول باشد.

**چەچە**: *čača* سەرجەمی دەست و پەنجە بۆ منداڵ. پنجه و کف دست در اصطلاح کودکان.

**چەچەوانە**: *čačawâna* خشڵی تایبەتی پەنجۆڵەی منداڵ. وسیله ای زینتی بافته شده از منجوق آبی با تزئین دانه‌های ریز صدف برای پنجه کودکان.

**چەخماخ**: *čaxmâx* هـا، ئامێرێك لە تفەنگ دا بۆ ئاگردانی بارووت بە کار دیی. چقماق، آتش زنه، آلتی در تفنگ.

**چەخماخە**: *čaxmâxa* تریشقە. انعکاس نـور و صـدای شـدید ناشـی از انفجار.

**چەرچی**: *čarči* دەست فرۆشی گەریدە. دوره گرد

**چەرچیگەری**: *čarčigari* پیشەی چەرچی. شغل دوره گردی.

**چەرخ**: *čarx* خـول، خولـێنە، خۆگـل. چرخ، ابـزاری گردنـده بـه دور خـود، دور، دوران، گردش، گردون و فلك.

**چەرخان**: *čarxân* وەرگەڕان. چـرخان، چرخنده، گردان.

**چەرخانن**: *čarxânen* چـەرخاندن، وەرگەڕانـدن. چـرخاندن، بـه چـرخ درآوردن.

**چەرخ و فەڵەك**: *čarxufaĭak* ها. چرخ و فلـك، نـوعی وسـیله بـازی و سـرگرمی هیجان‌آور.

**چەرخین**: *čarxin* وەرگەڕین. چـرخ زدن، چرخیدن، به دور چرخیدن.

**چەرم**: *čarm* پێستی دەواخـی کـراوی ماڵات. چرم، پوست دباغی شده.

**چەرمگ**: *čarmeg* سپی. سفید، سپید..

**چەرمگەوکردن**: *čarmegawkerden* سپیکردنەوە، سپی کاری. دوباره سفید کردن، سفیدکاری کردن.

**چەرمگەوکریاگ**: *čarmegawkeryâg* سپی کراو. سفید شده، سفید کاری شده.

**چەرمگی**: *čarmegi* سپیتی، سپیدی، وەکو (تۆچـەرمگی). سـفیدی، ماننـد (تـو سفید هستی).

**چەرمگی**: *čarmegi* سپیایی، سپیدی. سفیدی، سپیدی.

**چەرمەڕەق**: *čarmaŕaq* چەرمی قەڵەو و سەخت. چرم سخت و ضخیم.

**چەرمەسەری**: *čarmasarē* چەرمەرسەری، رەنـج، زەحمـەت. مـشقت، درد سر، زحمت، رنج.

**چەرمەکلێش**: *čarmakeĭeš* سـپیلانە، سپیلکە، چـەرمەلانە. سـفید پوسـت، کسی که دارای پوست سفید و نازك باشد.

**چەرمەڵانە**: *čarmaĭâna* سـپیلکە، سپیلانە، سپی روو. سفید آسا، سفید وارە، سفید مانند.

**چەرمێڵە**: *čarmēĭa* سـپیلە، چـەرمەڵ، نێوی گوندێکە. نام روستایی، سفید وارە.

**چەرمێنە**: *čarmēna* سپێنەی هـێلکە. سفیده تخم مرغ.

**چەس**: *čas* چیە. چیست، چه چیزی است.

**چەسپ**: *časep* کانزایەکە بۆ لکاندن. چسب، مادەای چسبنده برای اتصال اشیاء به هم.

**چەسپانن**: *časpânen* چەسپاندن، لکاندن. چسبانیدن، وصل کردن، پیوند کردن دو چیز به هم.

**چەسپێنە**: *časpēna* ئەوە کە دەچەسپێ. چسبنده.

**چەشتانن**: *čašânen* چەشتانن، چەشتاندن. چشاندن، مزه کردن، امتحان کردن.

**چەشت**: *čašt* چەش بوون. متوقع، عادت کردن، کنایە از عادت کردن به مفت خوری.

**چەشکە**: *čaška* تامکردن. طعم کردن، مزه کردن، چشیدن.

**چەشکەکردن**: *čaškakerden* تامکردن. طعم کردن، مزه کردن، چشیدن.

**چەشە**: *čaša* تام کردن، فێر بوون بە شتێ. متوقع، مزه کردن.

**چەشەبوون**: *čašabun* فێر بوون بە شتێ. عادت کرده.

چەشەخۆرە: *čašaxōra* چەشتە خۆرە. عادت کردهٔ، به مفت خوردن عادت کردن.

**چەشیاگ**: *čašyâg* چەشتاو، چەشراو. چشیده شده، آزموده شده.

**چەشین**: *čašin*چەشتن، تام کردن. چشیدن، طعم کردن، آزمودن، مزه کردن.

**چەشینەوە**: *čašinawa* چەشتنەوە. دوباره مزه کردن، طعم کردن بار دیگر.

**چەفت**: *čaft* لار، گێڕ، ناڕاست. کج، ناراست، دروغگو، شیاد، نابکار، خمیده.

**چەفت و چێڵ**: *čaftučēĭ* ناڕاست، زۆر گێڕ. کج و معوج، کج و کوله.

**چەق**: *čaq* چەقی ناوگۆشت، ڕەگ و پەی گۆشت. رگ و پی گوشت، بدون گوشت، کنایه از لاغر و ضعیف.

**چەق**: *čaq* پاداگر. مُصّر.

**چەق**: *čaq* بێخ، کۆنجی دەرگا. گیر، تنگنا.

**چەق**: *čaq* بێخ، کۆنج. بیخ، پایە و اساس، گیر، کنایه از آدم سمج.

**چەقالە**: *čaqâla* فریکە بادەم. چغالە بادام، محصول تازه رُسته و سبز رنگ درخت بادام یا زردآلو.

**چەقانن**: *čaqânen* چەقاندن، پێدا بردن بە تونەی. فرو بردن، فروکوفتن، کاشتن در عمق، فرو بردن در عمق.

**چەقچەقە**: *čaqčaqa* ئامێرێك لە نێو دەزگای ئاشدا. وسیلەای در آسیاب آبی از جنس چوب کە با پایین و بالا آمدن موجب فرود آمدن دانە گندم بە زیر سنگ آسیاب می شود.

**چەق درگا**: *čaqdergâ* لێوارەی دەرگا. پاشنه درب، بیخ درب.

**چەقڵی چەقان**: *čaqĭičaqân* نێوی پردێکی کۆن لە شاری سنەدا. نام پلی قدیمی جنب استادیوم فعلی در شهر سنندج.

**چەقۆکێش**: *čaqōkēš* شەڕانی. چاقوکش، کسی کە با چاقو دیگری را تهدید کند یا به او حمله کند.

**چەق مل**: *čaqmel* بێخ مل. بیخ گردن، متصل به شانه.

**چەقۆ**: *čaqō* کێرد. چاقو، آلت کوچك برای بریدن و تراشیدن که دارای دسته و تیغه است.

**چەقە**: *čaqa* پێ داگرتن لە سەر بایی یان نرخ. چانه زدن بر سر قیمت.

**چەقەبی**: *čaqabi* دارە بی خۆرسك. نوعی بید خودرو.

**چەقە چەق**: *čaqačaq* پێ داگرتن لە سەر بایی یان نرخ. چانه زدن بر سر قیمت.

**چەقەڵ**: *čaqaĺ* زیندەوەرێك کە لە ریوی لاوازترە. شغال، نوعی از روباه که اندامی لاغر و پاهای بلند دارد.

**چەقەڵە**: *čaqaĺa* لاواز، لەڕ. کنایە آمیز است، نسبت به آدمهایی که لاغرند.

**چەقە مل**: *čaqamel* لاواز، لەڕ، مل باریك و درێژ. گردن باریك، کنایە از آدم گردن دراز.

**چەقەوڕ**: *čaqawŕ* بۆنی سووتاوێك وەکو رۆن. بوی سوخته، بوی روغن سوخته و نامطبوع.

**چەقی**: *čaqi* چەقا، گیری خوارد. گیر کرد، گیر کردن.

**چەقیاگ**: *čaqyâg* چەقیو، چەقاو، گیر خوراو. فرورفته، گیر کرده.

**چەقین**: *čaqin* چەقان، وەکو (ئەوان چەقین). گیرافتادند، در فرورفتگی گیر کردن، مانند (آنها گیر افتادند).

**چەقین**: *čaqin* چەقیان. فرورفتن، گیر کردن، گیر کردن در گل ولای و هر چیز چسبنده دیگر.

**چەقینەوە**: *čaqinawa* چەقین بۆ جارێکی تر. دوبارە فروبردن یا فرو رفتن.

**چەك**: *čak* زللە، شەپلاخە. سیلی کە بە صورت نواختە گردد، چک بانکی.

**چەك**: *čak* گازنی کەوش دوور، ئەو کەرەستەیە وا هەلاج دەیدا لە کەمان بۆ شی کردنەوەی لۆکە، خوری. شستە حلاجی کە با آن بر زە کمان می کوبند، ابزار دست کفاش.

**چەکانن**: *čakânen* ملق لێدان، مژین. مکیدن، مك زدن.

**چەکمە پۆش**: *čakmapōš* ئەوەی چەکمەی لە پێ کردووە، ئاماژەیە بۆ پۆلیس و ژاندارم. چکمە پوش.

**چەکوتە**: *čakota* وەڵامێکی خراپ بەوەی کە دەڵێ (چە). اصطلاحی مانند کوفت، زهرمار.

**چەکوش**: *čakoš* چەکوچ، ئامرازێك بۆ بزمار کوتان. چکش، آلتی آهنی با دستە بلند برای کوبیدن.

**چەکەچەك**: *čakačak* دەنگی کەوش گوشاد، دەنگی پێڵاوی گوشا. صدای کفش گشاد یا فرسودگی آن.

**چەکەرە**: *čakara* چۆکەرە، چووزەرە. جوانه، محصولات جالیزی.

**چەکیان**: *čakyân* جووتبوونی دوو حەیوانی نێر و مێ لەگەڵ یەك، مڵك لێدان. جفت شدن در حالت جماع برای حیوانات، مك زدن.

**چەکین**: *čakin* مڵك لێدان، مژین، جووت بوونی نیر و مێ لە زیندەور دا. جفت شدن نر و ماده که برای حیوانات استعمال می گردد.

**چەگەل**: *čagal* شتان، چەها، چەنان. چه ها، چیزها.

**چەڵ**: *čaĭ* لقێکی بچووك لە چڵێ دار. تکەای چوب نازك.

**چەڵ**: *čaĭ* چڵ، لق. شاخه.

**چەڵ**: *čaĭ* تەڵ. تار، يك عدد از يك چیز دراز و کوچك.

**چەڵتووك**: *čaĭtuk* شەڵتوك. شلتوك، چلتوك، شالی برنج که هنوز آن را از پوست درنیاورده باشند، برنج نکوبیده.

**چەڵەمە**: *čaĭama* جناغ، چۆڵەمە. استخوانی در سینه مرغ به نام جناغ که به شکل عدد ۷ است.

**چەڵەمەشکێنێ**: *čaĭamaškēnē* چۆڵە مەشکێنە. جناغ شکستن، یک نوع شرط بندی.

**چەڵێ**: *čaĭē* لقێکی بچووك له چڵی دار. تکه چوب باریك، يك ساقه باریك.

**چەڵێك**: *čaĭēk* تەڵێك. يك تار.

**چەلین**: *čalin* لوان بۆ کەسێ، هەلیکی رەخساو بۆ کەسیکی بێکار و هەرزە. چریدن، کنایه از مفت خوری و موقعیت مناسب برای سو استفاده کردن.

**چەم**: *čam* چیم، ئەمن چیم. چه هستم، من چه هستم.

**چەم**: *čam* خەماو، چەم، لاری. خم، انحنا.

**چەم**: *čam* دۆڵ، چۆم، رووبار. رودخانه، نهر، آبریزگاه، دره.

**چەماندن**: *čamânden* لار کردنەوە. خم کردن.

**چەمانن**: *čamânen* چەمانن. خم کردن.

**چەمانن**: *čamânen* چی ئیمەن، وەکو (ئەوان چەمانن). چه نسبتی با ما دارند، مانند (آنها چه نسبتی با ما دارند).

**چەمانەوە**: *čamânawa* کۆمکردنەوە، خەمکردنەوە. خم کردن دوباره.

**چەم و خەم**: *čamuxam* بەرزی و نزمی، ناساف. چم و خم، پیچ و تاب، ناهموار.

**چەم و دۆڵ**: *čamudōĭ* چۆم و دۆڵ. دره و پرتگاه.

**چەمەدان**: *čamadân* دەفەری جل وکەرەسەی سەفر. چمدان، ساك مخصوص سفر.

**چەمەرە**: *čamara* شێوەیەك هەڵپەرکێ لە ناوچەی کرماشان و بەشی باشووری رۆژهەڵاتی پارێزگای کوردستان لە کاتی مەرگدا. رقص جمعی و دایره وار در مراسم عزا برای بیان عزاداری در

**سوار**: *swâr* دژی پیاده. سوار.

**سـواربوون**: *swârbun* خۆهاویـشتن بـه سەرپـشتی حـەیوان یـان کورسـی. سـوار شدن.

**ســـوارخاس**: *swârxâs* سوارچـــاك. سوارکار ماهر.

**سـوارکردن**: *swârkerden* بەسـەریەك دابەستن. سوار کردن، مستقر کردن.

**سـواره**: *swâra* سـواربوون لـه ئەسـپ، دەستەی سواران. سواره، سوار.

**سواکار**: *swâkar* وەستاکار. استاد کار.

**سـواکاری**: *swâkari* وەسـتاکاری. اسـتاد کاری.

**سـواڵ**: *swâĭ* گەای، گەدا. گـدایی، تکـدی گری، گدا.

**سـواڵکردن**: *swâĭkerden* گەای کـردن. گدایی کردن، تکدی کردن.

**سـواڵکەر**: *swâĭkar* گـەای کـەر. گـدا، متکدی، کسی که کار او تکدی گری باشد.

**سـوانن**: *swânen* سمانـدن، کـون کـردن، ساوین. سوراخ کردن، ساياندن.

**سـوانەوه**: *swânawa* سماندنـەوه، کـون کردنـەوه. سـوراخ کـردن مجـدد، مجـددا ساياندن.

**سواو**: *swâw* کاری خێر. ثواب، کارخیر، نیکویی.

**سواو**: *swâw* ساواو، سوێنراو، سوانراو. ساییده شده، صیقل داده شـده، تـراش داده شده.

**سـووجاده**: *sujâda* سـوجاده، چەشـنیك ژێـر راخـەری دەسـتکردی شاری سـنه کـه زۆر بەناوبانگـه. ســجاده، نــوعی گلــیم دست باف پشمی با اندازه های مختلـف، سجاده دستبافت کردسـتان مخـصوصاً سنندج از معروفیت خاصـی برخـوردار است که نوع ابریـشمی آن را نیـز مـی بافند.

**ســوجەمار**: *sojamâr* چەشنـێك مــار کەپێستـێکی زنجـیری و ڕەنگـینی هەیـه. یکی از انواع مارها که پوست بدن او دارای نقشهای زنجیری و تقریباً سرخ رنگ است.

**سوخاڵ**: *soxâĭ* زوخاڵ، زووخاڵ. زغـال، یکی از محصولات چوبی که پس از آتش زدن چوب به دست می‌آید.

**ســـوخاڵدان**: *soxâĭdân* هـــەمباری سوخاڵ. زغالدان، انبار مخصوص زغال.

**سۆخته**: *sōxta*تازه فەقێ. طلبه.

**سـۆخته**: *sōxta* کرێـژ سـووتاوی تلیـاك. سوخته تریاك.

**سـوخمه**: *soxma* جلـی نـیم قـەدی بـۆ قۆڵی ژنانه. نیم تنه بدون آستین که زنان روی لباس کُردی می پوشند.

**ســـوراحی**: *sorâĥi* توونگـــه، تـــونگی شەراب. صُراحی.

**سـۆران**: *sōrân* بەشـێك لـــه خـــەڵکی باشـووری کوردسـتان. سـوران، بخـشی از مـــردم کـــرد کـــه در میانـــه جغرافیـــای کُردستان زندگی می‌کنند.

**ســۆرانی**: *sōrâni* دەستپیـــچی جلـــی کوردی. پارچه سفید مچ پیچ مخـصوص لباس کُردی.

**سۆرانی**: *sōrâni* ئەوەی کە تایبەت بە خەڵکی سۆرانی زمانن. آنچه که مربوط به سوران باشد.

**سورمایی**: *sormâi(i)* بە ڕەنگی سورمە، نێوی تەپوڵکەیەکی بە نێو بانگە لە باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری سنە.

سورمایی گۆنای سوور هەڵگەڕاوت
فەرەجە ڕوومەت وەك خوەرەتاوت

بە رنگ آبی تیره، نام تپەای مشهور در شمال شرقی شهر سنندج.

**سورمە**: *sorma* کل. سُرمه، خاکه سرب که گردی سیاه رنگ است پلکها و مژه ها را با آن رنگ می زنند.

**سورمەدان**: *sormadân* کلدان. سُرمه دان، کیسه کوچک مخصوص سُرمه.

**سورمەیی**: *sormai(i)* ڕەنگی سورمە. رنگ آبی تیره و یکی از انواع رنگهای سرد.

**سوڕنا**: *sorńâ* سوڕنا، ئامیریکی ژەندن لە مۆسیقای فولکلوری کوردیی. سُرنا، یکی از انواع سازهای بادی است

**سوڕناژەن**: *sorńâžan* ئەو کەسەی کە سوڕنا دەژنی. سُرنا زن،کسی که کار او یا تخصص او درنواختن سرنا باشد.

**سۆز**: *sōz* ئەوەی کە دەسووتێنی، مۆرەکردن، کوڵی دەروون. سوزاننده، زمزمه.

**سۆزان**: *sōzân* نێوی چیایەکە لە ڕۆژهەڵاتی شاری سنە. نام کوهی درحومه شرقی شهر سنندج

**سۆزکردن**: *sōzkerden* خوێندنی (گۆرانی وتنی) ژێرلێو، مۆرە مۆر. ترنم کردن، زمزمه کردن.

**سۆزە**: *sōza* خوێندنی ژێر لچی، مۆرە کردن. ترنم، زمزمه.

**سۆزەسۆز**: *sōzasōz* خوێندنی ژێر لچی، مۆرەمۆر. ترنم متوالی زیر لب.

**سۆزەکردن**: *sōzakerden* مۆرەکردن. ترنم کردن، زمزمه کردن.

**سۆزی**: *sōzi* بەیانی، ڕۆژی داهاتوو. فردا، روز بعد.

**سۆس**: *sōs* سۆس ئارد، گەنم. سبوس آرد و گندم.

**سۆسەن**: *sōsan* نێوی گوڵێکی بۆنخۆشی کێوییە. گل سوسن، گلی وحشی و خودرو معمولا در کوهستان روئیده می‌شود پنج پر و شبیه گل نرگس است اما درشت‌تر از نرگس بسیار خوشبو و به رنگ سفید و رگه های بنفش و در اوایل بهار می روید نوع پرورشی‌آن نیز وجود دارد.

**سۆفی**: *sōfi* ئەو کەسەی کە مورید و ئەهلی عیبادەت و پێڕەوی تەریقەتە. صوفی، اهل طریقت.

**سۆفیلە**: *sōfila* دانەی گەورەی نێو تەزبیح. دانەهای درشت در تسبیح.

**سۆك**: *sōk* خۆپێوەنان بە ئارامی. حرکت آهسته در مقاربت.

**سۆك**: *sōk* هاسان لە کێش دا، کەم بایی، پێچەوانەی قورس. سبك، کم ارزش.

**سۆکایەتی**: *sōkâyati* بێ حورمەتیکردن. بی حرمتی، بی احترامی، حرف رکیك زدن.

**سۆکدەس**: *sōkdas* دەست سۆك، پیتدار. دست برکت دار، سبك دست.

**سوکنا**: *soknâ* ئوقرە. آرامش، آسودە، آرام شدن درد، التیام درد.

**سوکنایی**: *soknâi(i)* ئوقرە گرتن. آرامش یافته، آسودەگی.

**سۆکەڵانە**: *sōkaĭâna* زۆر سۆك، بچووك. کوچك، چیزی کوچك و کم حجم.

**سۆکەڵە**: *sōkaĭa* چکۆلە. سبك وزن، کم حجم، کوچولو، کم وزن.

**سۆکی**: *sōki* سووکایەتی، بێ حۆرمەتی. بی احترامی.

**سۆکی**: *sōki* دژی قورسایەتی، سووکی، هاسانی لە کێشدا. سبکی، کم وزنی، کم ارزشی.

**سۆڵ**: *sōĭ* سوێر، پڕخوێ. شور، یکی از انواع مزه ها.

**سۆڵاو**: *sōĭâw* ئاوی سوێر، ئاوی پڕ خوێ. آب شور.

**سوڵتان**: *soĭtân* پادشا. سلطان، پادشاه، حاکم، نامی زنانه.

**سوڵح**: *soĭĥ* ئاشتی، دژی شەڕ. صلح، آشتی.

**سۆڵە**: *sōĭa* بەستەڵەك، سەرمای توند، کزەی سەرپێست. سرمای زیاد، یخبندان، سوزش در پوست.

**سۆڵەسۆڵ**: *sōĭasōĭ* تووزانەوەی پێست. سوزش ممتد در پوست.

**سۆڵەکە**: *sōĭaka* پاش ماوەی کەشك، لورکی سۆڵ. تە مانده کشک ساییده شده، یکی ازمحصولات لبنی.

**سۆڵیان**: *sōĭiyân* تووزیان، چووزیان، سۆڵانەوە. احساس سوزش، خارش، دردناشی از زخم یا سرمازدگی.

**سۆڵیانەوە**: *sōĭyânawa* چووزاندنەوە. احساس سوزش، مور مور کردن.

**سۆما**: *sōmâ* هێزی دیتن. سوی چشم، قدرت دید چشم.

**سۆمایی**: *sōmâi(i)* هێزی چاو. قدرت دید چشم.

**سۆمپا**: *sōmpâ* بوخاری، کەرەسەی گەرمکردنەوە بۆ زستان. بخاری، از وسایل گرمازا بزرگ که سوخت آن چوب یا نفت است.

**سونقور**: *sonqōr* ناوی شارێکە لە پارێزگای کرماشان ئەم واژەیە لە نێوی باڵندیەکی راوکەر بە نێو سینقارەوە وەرگیراوە کە گوایا ئەو وشەیە موغولییە بووبێت. سُنقر، یکی از توابع استان کرمانشاه است این واژه دراصل مغولی است از نام پرندەای به نام سنقار یا سینقار که پرندەای شکاری است برگرفته شده که در فارسی پرنده باز و در سنندجی شمقار به آن اطلاق می گردد.

**سۆنە**: *sōna* بەت. مرغابی، اردك، مرغی است که در آب شنا میکند و منقار پهنی دارد و در لابەلای انگشتان او پرده هایی وجود دارد.

**سوو:** *su* ها، قازانجی پارەی قەرز. سود، ربا، نفع حرام.

**ســووتاندن:** *sutânden* ئاورتــێبەردان، گڕتێبەردان. سوزاندن، آتش کشیدن..

**سووتانن:** *sutânen* ئاوردان، سووزاندن، کاری سووتن. سوختن، سوزانیدن، به آتش کشانیدن

**ســووتك:** *sutek* خۆڵەمێــشی جگــەرە، سووتوو. خاکستر سیگار.

**سـووتکە:** *suteka* خۆڵەمێـشی جگـەرە، سووتوو. خاکستر سیگار.

**سووتمان:** *sutmân* هەرشتێ کە بسووتێ. آتش سوزی، هر چیز قابل آتش گرفتن.

**ســووتن:** *suten* ســووتاندن. ســوختن، سوزانیدن.

**سووتەڵ:** *sutaĭ* نیم سۆز. نیم سوختە.

**سووتەمەنی:** *sutamani* هەر شتێك کـە بسووترێ. سوختن.

**سووتیاگ:** *sutyâg* سووتێنراو، سووتراو. سوختە شدە، بازندە دربازی.

**سووتیان:** *sutyân* سووتان. سوختن.

**سووتیانەوە:** *sutyânawa* سووتاندنەوە. سوختن دوبارە.

**سووجەرگ:** *sujarg* سووجگەر. جگر و جگر سفید.

**سووجگەر:** *sujgar* سووجەرگ. جگر و جگر سفید.

**سـووچ:** *suč* هـا، قـوژبن، گۆشـە. گوشـە، زاویە.

**سووچدار:** *sučdâr* گۆشەدار، بە گۆشە. گوشەدار، زاویە دار.

**سووخوەر:** *suxwar* کەسێ کە پارە بە قـــەرز دەدا ســـوودی لـــێ وەردەگـــرێ، سووخۆر. رباخوار، نزول خوار.

**ســـــووخوەری:** *suxwari* کــــرداری سووخۆر. نزولخواری، رباخواری.

**ســوور:** *sur* ڕەنگــی ســوور، بــە ڕەنگــی خوێن. رنگ قرمز، سرخ، یکــی از انــواع رنگهای اصلی و گرم.

**سوور:** *sur* پێ داگر، چەق بەستوو. مصّر.

**سووڕ:** *suŕ* دەور، خـول. چـرخش، چـرخ، دور.

سـوور بـوون: *surbun* پـێداگرتن لەسـەر کـارێ یـان شـتێ، سـوورەو بـوون. اصـــرار داشتن، سرخ رنگ شدن، از رو رفتن.

**ســــــــووربوونەوە:** *surawbunawa* شەرمەسـار بـوون. شرمـسار شـدن، سـرخ شدن از شرمساری.

**سووڕدان:** *suŕdân* خولاندن. چرخاندن، چــرخانیدن، گردانـــدن، بـــە گـــردش در آوردن.

**ســووڕدریاگ:** *suŕderyâg* ســووڕدراو. چرخ دادە شدە، چرخاندە شدە.

**سووڕکردن:** *suŕkerden* بەڕەنگی سوور دەرهێنان. سرخ کردن.

**ســـووركردنەوە:** *suŕkerdenawa* لــە ڕۆن دابرژانـــدن، شـــەرمەزارکردن. ســـرخ کردن در روغن، گداختن و برشتە کـردن، کنایە از حالتی کە کسی کس دیگری را بـە حالت شرمساری در آورد.

**سووروسـات:** *surusât* جـەژن و خۆشـی. سوروسات، مراسم جشن و سرور، مهمانی.

**سوورەبنە**: *surabna* کەسی قژ سوور، نێوی گیایەکە. نام گیاهی است، کنایە از آدم سرخ مو و سرخ روی.

**سوورەچنار**: *suračenâr* چناری جەوان و گەورە. چنار جوان و پُرشاخ و برگ.

**سوورەسوور**: *surasur* سوورهەڵگەڕاو. حالتی از صورت عرق کردە و سرخ شدە.

**سوورەوبوو**: *surawbu* سوور بوونەوە. سرخ شد، سرخ شدن از خجالت.

**سوورەوبووگ**: *surawbug* سوورەوکراو. سرخ شدە، رخسار سرخ شدە.

**سوورەوکردن**: *surawkerden* برژاندن لە ڕۆندا، شەرمەزار کردن. سرخ کردن در روغن، از روبردن.

**سوورەوکریاگ**: *surawkeryâg* سوورەوکراو. سرخ شدە.

**سوورەهەڵاڵە**: *surahaĭâĭa* سوورەهەراڵە. آلالە سرخ.

**سووری**: *suri* ڕەنگی سوور. سرخی، قرمزی.

**سووڕیان**: *suŕyân* خولیان. چرخیدن، بە گردش در آمدن.

**سووڕیانەوە**: *suŕyânawa* خولیانەوە. چرخانیدن.

**سووریجە**: *surija* سوورێژە، سۆرك. سُرخک، از بیماریهای پوستی در کودکان کە بە صورت جوشهای ریز قرمز رنگ است.

**سووزن**: *suzen* دەرزنی گەورە. سوزن بزرگ، جوالدوز.

**سووزاندن**: *suzânden* سووتاندن. سوزاندن.

**سوزانن**: *suzânen* سووتانن. سوزاندن.

**سووزەنی**: *suzani* ژێرڕاخەرێك تایبەت لە حەمامی ژنانە. زیر انداز مخصوص حمام زنان از جنس پارچە.

**سووزیا**: *suzyâ* سووتێنرا، وەکو (کراسە کەم سووزیا). ماضی سوختن، سوخت، مانند (پیراهنم سوخت).

**سووزیاگ**: *suzyâg* سووزراو، سووتێنراو. سوختە شدە، آتش گرفتە.

**سووزیان**: *suzyân* سووتیان، سووتان. سوختن.

**سووکە**: *suka* ئامێری تایبەت بە چنین و هۆنێنەوە. میلە بافتنی.

**سوەیل**: *swayel* ئەستێرەی سوەیل. ستارە سهیل، از صورفلکی، نامی برای زنان.

**سەا**: *saâ* دەنگ، وەکو (سەای ناڵەی نەی). صدا، مانند (صدای نالە نی).

**سەبووری**: *saburi* ئارامبوون لە کاتی ڕووداوێکی تاڵ سەبر پێشە کردن. صبوری، بردباری، صبرداشتن، تحّمل کردن.

**سەبیل**: *sabil* ئامێرێك بۆ کێشانی تووتووون. چُپُق، مخصوص دود کردن تنباکو.

سەبیلخوەر: *sabilxwar* ئەوەی کە بە سەبیل تووتوون دەکێشی. چپُق کش، کسی کە سبیل دود میکند.

**سەبیلساز**: *sabilsâz* ئەوەی کە پیشەی سەبیل دروستکردن بووە. چپق ساز، کسی که شغل او ساختن سبیل است.

سەبیلکێش: *sabilkēš* ئـەوەی کـە بـە سەبیل تووتوون دەکێشی. چپق کش.

**سەپۆل**: *sapōl* گێلۆکە، وەکو (ئەو پیاگە سرووسە پۆلە). گیج، منگ، پخمه، دست پا چلفتی، مانند (آن مرد گیج و منگ است).

**سەتڵ**: *sateĭ* دەفری ئاوهێنان. سطل ظرف مخصوص آبکشی.

**سەحب**: *saĥb* بەیانی. صبح، پگاه، بامداد.

**سەحپ**: *saĥp* بەیانی. صبح، پگاه، بامداد.

**سەحر**: *saĥer* جادوو، سێحر. سحر، جادو، جنبل.

**سەحرباز**: *saĥerbâz* جادووباز. ساحر، جادوگر، شعبده باز هم اتلاق می گردد.

**سەحنچە**: *saĥanča* دەفرێك تایبەت بۆ حەمامی ژنان. تشتی کوچك کە در حمام مورد استفاده زنان بوده.

**سەحەر**: *saĥar* بەرەبەیان، نێوێکی ژنانەیە. سحر، بامداد، نامی برای زنان.

**سەحەری**: *saĥari* لێدانی دەهۆڵ و سورنا لە کاتی بەرەبەیان، نێوی مقامێکە لە مۆسیقای کوردیدا. سحری، هنگام سحر، نواختن آهنگی که سحرگاهان با سرنا نواخته می‌شد برای بیدار کردن مردم جهت انجام فرایض دینی مانند روزه، یکی از مقامهای موسیقی کُردی.

**سەخت**: *saxt* سەخڵەت، زەحمەت، دژوار. سخت، دشوار، سفت.

**سەخناخ**: *saxnâx* ناوی کێوێکە، کێو. نام کوهی در کردستان، کوه.

**سەختی**: *saxti* سەخڵەتی، دژواری. صیغه مصدری سخت به معنای سختی.

**سەختی**: *saxti* پەیام و راسپاردە لە رێ دوورەوە. پیام حاوی سفارش از راه دور.

**سەد**: *sad* بەند ئاو. سد، سد وحدت در سنندج یکی از منابع مهم توزیع آب، گردشگری و پرورش ماهی است.

**سەد**: *sad* دوای نەوەد و نۆ، ژمارەی ١٠٠ سەد. عدد صد ١٠٠.

**سەر**: *sar* سەری مرۆڤ. سر، کله آدمی.

**سەر**: *sar* سەروژوور، بڵەندایی. بالا، ارتفاع، بلندی.

**سەر**: *sar* بانتر، سەرو، بەروو. سر، برتر، ارجح.

**سەر**: *sar* هەر شتێك لە باڵادایە. سر، آنچە کە بالا قرارگرفتە، بار، دفعه، جانب، سرپوش ظرف.

**سەر**: *sar* بۆ ئەژماردنی مەڕوماڵات بە کاردێ، وەکو (پەنج سەر پەز). واحد شمارش احشام، مانند (پنج رأس گوسفند).

**سەڕ**: *sař* سەڕە، دەنگی بەرزی ئولاغ. عرعر الاغ.

**سەرئامەو**: *sar âmaw* سەرئامەد، سەربوون، سەرئامەت. سرآمد، برتر.

**سەرئێشان**: *sarēšân* ژانە سەر. سردرد.

**سەر ئێشاندن**: *sar ēšânden* ژانە سەری. سردرد گرفتن.

**سەر ئێشانن**: *sar ēšânen* ژانە سەر. سردرد، درد سردادن.

**سەرئێوارە**: *sarēwâra* دەمەوئیوارە. هنگام عصر، نزدیک به زمان غروب.

**سەڕاف**: *saŕâf* پیشەی پوول گۆڕێن، پوول فرۆش. صراف، کسی کە شغل او داد و ستد پول باشد، زرشناس.

**سەڕافی**: *saŕâfi* پیشەی پوول گۆڕینەوە یا دراوگۆڕینەوە، ژماردنی پوول. شغل پول تعویض کردن مانند تبدیل ارز بە ریال یا بالعکس، شمارش پول هم معنی می‌دهد.

**سەرانسەر**: *sarânsar* سەرتانسەر، سەرانسەر. سرتا سر.

**سەڕانن**: *saŕânen* سەڕاندن، سەڕە کردن. عرعر کردن الاغ.

**سەراو**: *sarâw* سەرچاوکە، سەراوی نەڕان یەکێ لە بە ناوبانگترین سەیرانگاکانی ناوچەی سنەیە کە لە داوینی چیای (سوڵتان سەراجەدین)دایە. سرچشمە، منبع آب.

**سەراو**: *sarâw* ئاوی کاتی لە دایکبوونی منداڵ، تەڕایی هاوڕێ لە دایکبوون. مایع همراە نوزاد در حال تولد.

**سەراو توقین**: *sarâwtoqin* تەڕایی هاوڕێ لە گەڵ منداڵ لە کاتی ژانی ژن. جاری شدن مایعی کە همراە نوزاد می‌آید، زا بە راە.

**سەراو قامیش**: *sarawqâwmiš* نێوی گوندێکە لە باکوری شاری سنە. نام روستایی در شمال غربی شهر سنندج کە بە خاطر کشت و تولید نوعی خربزە خوش عطر و بو و شیرین از معروفیت خاصی برخورداراست.

**سەرباشقە**: *sarbâšqa* سەردەستەی ڕێگران. سر دستە راهزنان.

**سەرباڵ**: *sarbâĭ* شاپەڕ، پەڕی گەورا. شاهپر، پربزرگ.

**سەربان**: *sarbân* دێوی دەرەوەی بان. بالای بام، پشت بام، این واژە بیشتر در روستاها تلفظ می‌شود.

**سەربڕ**: *sarbeŕ* جەلاد، جەلاو. جلاد، کسی کە سر می‌بُرد.

**سەربڕان**: *sarbeŕân* سەر بەتیخ جیا کردنەوە بە کۆمەڵ، کۆمەڵکوژی. سر بُریدن و کشتار جمعی.

**سەربڕیاگ**: *sarbeŕyâg* سەربڕاو. سربُریدە شدە.

**سەربڕین**: *sarbeŕin* سەرجیاکردنەوە لە لەش. سربُریدن.

**سەربناو**: *sarbanâw* ناوی سەیرانگایە کە لە کرماشان. نام باغ و تفریحگاهی در کرمانشاە.

**سەربوڵەن**: *sarboĭan* سەرفەراز. سربلند، سرفراز.

**سەربەرز**: *sarbarz* سەرفەراز. سربلند، سرفراز.

**سەر بەرزکردنەوە**: *sarbarzkerdenawa* سەر هەڵێنان، یاخی بوون. سربلند کردن، طغیان کردن.

**سەربەرزی**: *sarbarzi* سەربوڵەندی، شانازی. افتخار، سربلندی، سرافرازی.

**سەربەرەوخواری**: *sarbarawxwâri* لێژایی. سرازیری.

**سەربەرەوژووری**: *sarbarawžuri* ژوورکایی. سربالایی.

**سەربەرەوژێری**: *sarbarawžēri* روو بەلێژایی. سراشیب، رو به سرازیری از پایین.

**سەربەسە**: *sarbasa* سەربەستە. سربسته، پوشیده، پنهان، مخفی.

**سەربەسەر**: *sarbasar* شت گۆڕرینەوە به بێ باقی. مبادله پایاپای، برابر.

**سەربەمۆر**: *sarbamōr* مۆر کراو، دەس لێ نەدراو. سر به مهر، دست نخورده.

**سەربەن**: *sarban* سەر پۆش، مێزەر. سربند، پوشش درب ظرف.

**سەربەیەکەونیان**: *sarbayakawniyân* چپەکردنی دوو کەسی. سردرگوش هم نهادن.

**سەرپا**: *sarpâ* ویستان لە سەر پێ، سەر پێ. سر پا، ایستاده.

**سەرپان**: *sarpân* کەسێك کە سەری پانی هەبێ. کسی که سری پهن دارد، سر پهن.

**سەرپایی**: *sarpâi(i)* سەرپێی. سرپایی، کار سرپایی، دمپایی.

**سەرپڕ**: *sarpeŕ* لیوانلێو، لێورێژ. لبریز، لبالب.

**سەرپۆش**: *sarpōš* لەچك. سرپوش، روسری.

**سەرپەتی**: *sarpati* سەرڕووت، دەستودڵباز. سر بدون پوشش، دست و دلباز، اصطلاحی است که به شخص دست و دلباز اتلاق می‌گردد.

**سەرپەرست**: *sarparast* گەورەی ماڵ، گەورەی دایرە. سرپرست، بزرگتر خانواده، نظارت کننده بر اعمال و کردار افراد تحت تکفل.

**سەرپەل**: *sarpal* فەرمانـدەر، چڵی دار. آخرین شاخه درخت، فرمانده، رئیس

**سەرپەنجە**: *sarpanja* سەری پێنج ئەنگووست بەگشتی. سر پنجه، سر انگشتان، کنایه از زور، قدرت و نیرو.

**سەر پێ سپاردن**: *sarpēsepârden* بریتی لە بڕوای تەواو کردن بە کەسێ. سر به او سپاردن.

**سەرتا**: *sartâ* مێوەی هەرەباش. میوه نمونه که سر بار می‌چینند.

**سەرتاپا**: *sartâpâ* ئەندام. سرتاپا، تمام قد.

**سەرتاپا**: *sartâp* سەرتا پێ، تەواولەش. سرا پا، از بالا تا پایین.

**سەرتاشیاگ**: *sartâšyâg* سەرتاشراو. سرتراشیده شده.

**سەرتاق**: *sartâq* بان تاق. بالای طاق، چوب کار گذاشته شده روی طاق.

**سەرتۆ**: *sartō* توێژی سەرماست و شیر. خامه، سرشیر، لایه چرب روی ماست.

**سەرتۆپ**: *sartōp* قەلە پۆپەی دار یان ئاڵا، یەکم لە جوانی. آخرین حد ارتفاع، گردی توپ مانند سر علم، زیباترین.

**ســــــەرتەپۆڵە**: *sartapōĭa* نـــــێوی گەرەکـێکی قـدیمی لـە شـاری سـنە لـە دەورانی میرایـەتیی ئەردەڵانەکانـدا یـەکی لـە چـوار دەروازەی شـاری تێـدا بـووە. محلەای قـدیمی در مرکـز سـنندج بـە همین نام کە یکی از چهار دروازه اصـلی شهر در دوران اردلانها دراین محلە بوده است.

**ســەرتەرز**: *sartarz* چـڵی زۆر ناسـك. شاخە نازك و ترد سبز رنگ درخت.

**سەرتەزێن**: *sartazēn* ئـاماژەیـە بـۆ زۆر سارد، نێوی چیـایەکـە لـە ناوچەی (تیلـە کو) سەر بە دیوانـدەرە. کنـایە از آب یـا نوشیدنی خیلی سرد کە پس از مـصرف درسر ایجاد درد کند، نام کوهی است در منطقە (تیلە کو) دیواندره.

**ســەرتەڵ**: *sartaĭ* سـەرتا، میـوە یـان هەرشـتیکی باشـی هەڵبـژاردە. برگزیـدە، نمونە میوه یا هر چیز دیگر.

**سەرتیاچوون**: *sarteyâčun* کوژران، لـە نێوا چوون. کنایە از نابود شدن و بە قتل رسیدن.

**سەرتیژ**: *sartiž* نووك تیژ، سەرتووژ. نوك تیز.

**سەرتـــــــــێکردن**: *sartēkerden* سەرپێوەنان، سـەرکردنەناو. رفتن متوالی بە جایی، ولخرجی کردن، اسراف کردن.

**ســەرتیل**: *sartil* دوایـن سەرچـڵ یـان پۆپە. آخرین حد ارتفاع.

**سەرجەم**: *sarjam* تێکڕا بەگشتی. جمعی، همە با هم، مجموع.

**ســــەرجەنجاڵ**: *sarjanjâĭ* ســــەرقاڵ. سرشلوغ، کسی کە دارای مشغلە زیاد باشد.

**سەرچـــاوکە**: *sarčâwka* سەرچـــاوگە، سەرچاوە. سرچشمە، منبع اصلی.

**سەرچـــاوگە**: *sarčâwga* سەرچـــاوە. سرچشمە، منشاء.

**سەرچـــــاوە**: *sarčâwa* سەرچـــــاوکە. سرچشمە، منبع اصلی.

**سەرچڵ**: *sarčeĭ* چـڵی بـەرز ناسـکی دار، سەر لەق. شاخە بالایی و نازك درخت.

**سەرچن**: *sarčen* سەرتا، هەڵبژارندن. چیدن و قطـع کـردن قـسمت بـالایی، انتخاب کردن و برگزیدن میوه.

**سەرچۆپی**: *sarčōpi* ئەوەی کە لە پێش هـەمموو هەڵپەڕکێکەراندایـە. جلـــودار و پیشاهنگ رقص دستە جمعی کُردی.

**سەرچـــۆك**: *sarčōk* کەشـــکی ئـــەژنۆ، کەشکەزرانی. بالای زانو، کشك زانو.

**سەرچـوون**: *sarčun* دوایـی هـاتن، لـە جۆشـرانی زۆر وەدی دێ، وەکـو (شـیرەکە سـەر چـوو). ســـرفتن چیـــزی در اثـــر حرارت، بە سر آمدن حوصلە، مانند (شیر سر رفت)

**سەرچۆك**: *sarčōk* بە چۆك دانشتن. چمباتمە.

**سەرچەم**: *sarčam* بەستێن. بالا و کنارە رودخانە.

**سەرحەســاو**: *sarĥasâw* ئاگـــادار، بـــا خەبەر. باخبر، آگاه، مطلع.

**سەرخستن**: *sarxesten* بردنە سەرەوە. بالا بردن، کمک بە برآوردن آرزو و رسانیدن به مقصود کسی.

**سەرخوەش**: *sarxwaš* سەرخۆش. سرخوش، سرمست.

**سەرد**: *sard* سارد. سرد، آب و هوا سرد یا هر چیز دیگر که درجه حرارت آن کم باشد.

**سەرداخستن**: *sardâxesten* سەربەرەوخۆنان. بە زیر نگاه کردن، آبروی کسی را بردن.

**سەرداگرتن**: *sardâgerten* سەر پۆشاندن، خەریك کردن. سرگرم کردن، مشغول کردن.

**سەردان**: *sardân* بە دیدار رۆیشتن، دیتن کردن، مێوانی چوون. دیدار کردن، سر زدن.

**سەردان**: *sardân* سەرکێشان بۆ دیدار. سرکشیدن، به ملاقات رفتن.

**سەردانیان**: *sardâniyân* سەرنیان، کورنش کردن. سرنهادن، تعظیم کردن.

**سەرداهاوردن**: *sardâhâwerden* سەری باس دەرهێنان، شانە کردنی قژی سەر. شانه زدن مو سر، سر سخن باز کردن، تعظیم کردن

**سەرد بوون**: *sardbun* سارد بوون. سرد شدن کنایه از بی محل گذاشتن.

**سەردبوونەوە**: *sardbunawa* ساردبوونەوە. سرد شدن.

**سەردرگا**: *sardergâ* سەردەرکە. روی درب، طاق درب.

**سەردەرهاوردن**: *sardarhâwerden* سەردەرهێنان. سردرآوردن، خود نمایاندن.

**سەردکردن**: *sardkerden* سارد کردن. سرد کردن، خنك کردن.

**سەردوسڕ**: *sarduseŕ* ساردوو سڕ. بسیار سرد، کنایه از بی التفاتی.

**سەردوسڕی**: *sarduseŕi* ساردووسڕی. زمان سرما، نشانه بی غیرتی.

**سەرد و گەرم**: *sardugarm* سارد و گەرم. سردوگرم، کنایه از تجارب زندگی.

**سەردەر**: *sardar* تاقی سەردەرکە. طاق بالای درب، چوب بالای درب.

**سەردەرچوون**: *sardarčun* سەردەرکردن، ئاگادار بوون لە. سر در آوردن، با اطلاع شدن.

**سەردەرکردن**: *sardarkerden* سەردەرچوون لە، ئاگادار بوون لە، تێگەیشتن، تێگەیین. سردر آوردن، مطلع بودن، شناخت.

**سەردەس**: *sardas* سەردەست. روی دست، آستین.

**سەردەسە**: *sardasa* رێبەری کۆمەڵێکی بچووك، سەری قۆڵی کراس. سردسته، آستین نزدیك به مچ پیراهن یا کُت.

**سەردەم**: *sardam* کات، سات، دەور. هنگام، اوان، دور، زمان، عصر.

**سەردەمەنی**: *sardamani* ساردەمەنی. خوراک سرد، غذاهایی که در اصطلاح عامه سردی آوراند.

**سەردەمێك**: *sardamēk* زەمانێك، دەورێك. زمان، عصری، دوره ای.

**سەردەوبووگ**: *sardawbug* ساردەوكراو. سرد شده.

**سەردەوبوون**: *sardawbun* ساردبوونەوە. سرد شدن.

**سەردەوكردن**: *sardawkerden* ساردەوكردن. سرد كردن، سرد نمودن.

**سەردی**: *sardi* ساردی. سردی، منسوب به سرد.

**سەرڕاس**: *sarŕâs* راستەوڕاست. مستقیم، درستكار، سرراست.

**سەراسێ**: *sarâsē* جۆرێك ژانە سەرە. نوعی سردرد مانند میگرن.

**سەرڕەق**: *sarŕaq* سەرسەخت. سرسخت، كله شق.

**سەرڕێژ**: *sarŕēž* لێوانلێو، لیوڕێژ. لبالب، لبریز، سرریز.

**سەرڕێگا**: *sarŕēgâ* سەرِەڕێ، سەر ڕێگا. محل عبور، روی راه، راه عبور.

**سەرزل**: *sarzel* زلام سەر. كسی كه سر گنده دارد، سربزرگ.

**سەرزەنشت**: *sarzanešt* لۆمە، سەرزەنش. سرزنش، سركوفت، طعنه، ملامت، نكوهش.

**سەرسپاردن**: *sarsepârden* فەرمانبەری. سرسپردن.

**سەرسم**: *sarsem* ڕەتی یەك سم. سكندری خوردن چهارپا.

**سەرسمدان**: *sarsemdân* ڕەتدانی یەك سم. سكندری خوردن چهارپا.

**سەرسۆك**: *sarsōk* ئاسوودە. آسوده خاطر.

**سەرسوور**: *sarsuŕ* سەیر. مات، متحیر.

**سەرسۆنگە**: *sarsōnga* بە ئارامی، بە ئەسپایی، وەكو (سەرسۆنگە خەریك خوەندنم). به آرامی، با تأنی، مانند (با تأنی و آرامش مشغول مطالعه هستم).

**سەرسەخت**: *sarsaxt* سەرڕەق. سرسخت، لجوج.

**سەرسەنگین**: *sarsangin* بە دەمار بوون، لالووتبوون. سرسنگین.

**سەرسەوز**: *sarsawz* دڵووان، زۆر شاد. سرسبز، شاداب و با طراوت.

**سەرشان**: *saršân* كۆڵ، ملەی كێو. روی شانه، ستیغ كوه.

**سەرشانە**: *saršâna* سەرپشت، سەركۆڵ. روی شانه، گرده.

**سەرشكێن**: *saršekēn* داشكاندن. سرشكن،كم كردن از جایی و اضافه كردن به دیگری.

**سەرشۆڕ**: *saršōŕ* شەرمەسار. سرافكنده، شرمسار.

**سەرشۆڕكردن**: *saršōŕkerden* كورنشكردن. سرافكنده كردن، شرمسار كردن، سرافكندگی.

**سەرشێت**: *saršēt* وڕوگێژ. خل، نیم دیوانه.

**سەرشێوان**: *saršēwân* سەرتێكدان. سردرگمی، آشفتگی.

**سەرفەراز**: *sarfarâz* سەربڵند. سرافراز، پیروزمند، مفتخر.

**سەرقاڵ**: *sarqâĭ* خەریك، زۆر خەریك بە كار. سرگرم، مشغول.

**سەرقەڵەمانە**: *sarqaĭamâna* حەقدەستی دوعانووس. مزد دعا نویس.

**سەرقەوی**: *sarqawi* سەرزل، سەرزەلام. سرگندە، كسی كە سر بزرگ دارد.

**سەركردە**: *sarkrda* فەرماندەر. سردستە، رهبر، فرماندە.

**سەركز**: *sarkez* پەرێشان، خەمین، سەرشۆڕ. گردن كج، پریشان حال، غمگین، سرافكندە از اندوە.

**سەركوت**: *sarkot* تانەلێدان، سەرزەنشت. سركوب، طعنە و سرزنش.

**سەركوڵ**: *sarkoĭ* بۀركولَ. اولین قاشق از غذای آمادە شدە.

**سەركۆڵ**: *sarkōĭ* سەرپشت. روی پشت، گردە.

**سەركەف**: *sarkaf* كەفی سەر چێشت، كەفی سەرئاوی سابوون. سركف صابون یا شیر و هرمایع مشابهی كە كف كند.

**سەركەفتن**: *sarkaften* سەركەوتن. موفق شدن، بە آرزو رسیدن، پیروز شدن.

**سەركەنیاگ**: *sarkanyâg* سەركەنراو. سركندە شدە، موجود بی سر.

**سەركێشان**: *sarkēšân* دیداركردن، سەر كێشاندن. سرك كشیدن، دیدار كردن.

**سەركێشتی**: *sarkēšti* یاخیبوون، دیەنیكردن. سركشی، دیدار كردن، نافرمانی كردن.

**سەرگران**: *sargerân* مرۆڤی فیزن. رام نشدە، سرسنگین، متكبر.

**سەرگرتن**: *sargerten* سەرگرتوو. سرگرفتن.

**سەرگوڵ**: *sargoĭ* بەركوڵی هەر خواردنەوە یەیكی دەمكراو، ئەوەڵین ئیستكان چای تازە دەمكراو. اولین برداشت از چای دم كردە، اولین استكان چای از قوری.

**سەرگەورە**: *sargawra* سەردەستە، رێبەر. سردستە، رهبر، فرماندە، رئیس.

**سەرلك**: *sarlek* چڵ یان لكی سەرەوەی دار. شاخە بالایی درخت.

سەرلێشێویان: *sarlēšewyân* سەرشێویان، وەكو (ئەم كارە بێژگە لە سەرلێشێویان خێرێكی نییە). سردرگم كردن، مانند(این كار غیر از سردرگمی فایدەی دیگری ندارد).

**سەرما**: *sarmâ* دژی گەرما. سرما، هوای سرد.

**سەرمابردگ**: *sarmâberdeg* سەرمابردوو. سرما زدە.

**سەرمابوون**: *sarmâbun* سەرمالێدان. سرما خوردن.

**سەرمابەردەڵە**: *sarmâbardaĭa* كەسێك كە خۆی لە بەر سەرما بۆ ناگیردرێ. آدم سرمایی، سرما زدە.

**سەرماوسۆڵە**: *sarmâwsōĭa* ساردی، سەهۆڵبەندان. سرما و یخبندان.

**سەرمەست**: *sarmast* سەرمەس، سەرخۆش. سرمست، سرخوش، با نشاط.

**سەرمەقولات**: *sarmaqolât* خۆ ئاوەژووکردن بەسەر سەردا و تێپەڕین. پشتك وارو.

**سەرمەڵا**: *sarmaĭâ* سەرباشقە، سەردستە. ادارە کنندە بازی.

**سەرنج**: *saranj* وردەوبوون، زۆر بەوردی، وردەوەبوون، وردبوونەوە. دقت، توجە، مشاهدە دقیق.

**سەرنجدان**: *saranjdân* وردبوونەوە، رامان. دقت نمودن، توجە کردن.

**سەرنقوم**: *sarnoqm* سەرنخوون، بێ سەروشوێن. سرنگون، واژگون، نگون سار.

**سەرنویی**: *sarnewe* نێوی مەحەلێکە لە رۆژئاوای شاری سنە کە سەرچاوەی بەشێکی گەورە لە ئاوی خواردنەوەی ئەم شارە بووە. نام محلی در ضلع غربی شهر سنندج کە منبع مهم آب آشامیدنی شهر بودە است.

**سەرنیان**: *sarneyân* سەرنان، رۆیشتن و ئاوارەبوون. سر گذاشتن، سرنهادن، آوارە گشتن.

**سەرنیانەوە**: *sarneyânawa* سەردانانەوە، سەرنانەوە. سرنهادن دوبارە.

**سەرواز**: *sarwâz* سەرباز. سرباز، جنگاوری کە بە خاطر دفاع از مرز و بوم کشورش مدت معینی را بە طور مجانی در اوایل جوانی در ارتش خدمت می کند.

**سەروازخانە**: *sarwâzxâna* سەربازخانە. سرباز خانە، محل زیست سربازان.

**سەروازگیری**: *sarwâzgiri* سەربازگیری. سربازگیری.

**سەروازی**: *sarwâzi* سەربازی، لە زاراوەی خەڵکی سنە دا بە جێی سەروازی، دەگوترا ئیجباری. سربازی.

**سەرواقنگ**: *sarwâqeng* سەرنخوون، ئاوەژوو، بەروا پشت. وارونە، سرآویز، آویزان، آویختە.

**سەروبن**: *saruben* سەروژێر. سر و تە چیزی، در اصطلاح بە معنای بررسی کردن است.

**سەروبەچك**: *sarubačk* تەحر، سیما، شکڵ. سر و صورت، سر و روی، سر و سیما.

**سەروبەر**: *sarubar* سەروبەچك. سر و وضع، سروسامان، برورو.

**سەروپورت**: *saruport* بەش بەشکردن. بە هرکسی سهم اندکی دادن، تقسیم عادلانە بین جمع.

**سەروچاو**: *saručâw* روخسار، هەنیە، سیما. صورت، رخسار.

**سەروخوار**: *saruxwâr* سەربەرەوژێر. بالا و پایین، کنایە از فراز و نشیب.

**سەروخوارکردن**: *saruxwârkerden* هاتوچۆکردن، خواروژوورکردن. بالا و پایین کردن، آویزان کردن.

**سەروزوان**: *saruzwân* سەر و زمان. سر و زبان، کنایە از شیوە بیان.

**سەروژێر**: *saružēr* سەروخوار، ژێر و بان. بالا و پایین، کنایە از فراز و نشیب زندگی.

**سەروساخت**: *sarusâxt* کەین و بەین، ساختوپاخت. کنایە از تبانی بین دو یا چند نفر، برای انجام دادن کاری.
**سەروسەکوت**: *sarusakot* سەروسیما. سرورو، شکل و قیافە.
**سەروسەکەڵ**: *sarusakaĭ* سەروسیما. سرورو.
**سەروکاوڵ**: *sarukâweĭ* تەحر، سەروکاپۆڵ. سروسیما، جمجمە.
**سەروێن**: *sarwēn* مێزەر. دستار، عمامە.
**سەرە**: *sara* گوێزی دەسکەڵا، مرۆڤی بەرجەستە و دیار. گردوی خوش دست در تیلە بازی، نخبە.
**سەرە**: *saŕa* دەنگی کەر. عرعر، آوای الاغ.
**سەرەتاتکێ**: *saratâtkē* ملەتاتکێ. سرك کشیدن.
**سەرەخەر**: *saraxar* بەکەسێك دەڵێن کە لە کاری کەسانی تردا بە بێ ئیجازە خۆی تێ بگەیەنێ. سرخر، کنایە از آدم مزاحم و بولهوس.
**سەرەخوەر**: *saraxwar* منداڵی تازە بووی کە دایك یا بابی مردوو بێ. نوزادی کە پس از تولد پدر یا مادرش را از دست بدهد، کنایە از بد قدمی و بدشگونی نوزاد است.
**سەرەڕا**: *saraŕâ* لەگەڵ ئەوەدا، لەگەڵ ئەویشا، وەکو (سەرەڕای ئەمە). با وجود اینکه، مانند (با وجود اینکه).
**سەرەڕیان**: *saraŕeyân* سەرەڕێگا. سرراهها، محل تلاقی چند مسیر.
**سەرەڕێگا**: *saraŕēgâ* سەرەڕێ. سرراه، گذرگاه، محل عبور.
**سەرە ڕێگە**: *saraŕēga* سەرە ڕێگا. سرراه، گذرگاه، محل عبور.
**سەرەڕیە**: *saraŕeya* سەرەڕێگا. سرراه، گذرگاه، محل عبور.
**سەرەن**: *saran* سەرەند. سرند، نوعی غربال سیمی کە برای بیختن خاك و شن بکار میرود.
**سەرەو**: *saraw* سەری سەر، سەرسەرەو. بالا، طرف بالا، بالای بالا.
**سەرەوخوار**: *sarawxwâr* سەرنخوون، ئاوە ژوو، روو بەخوار. سرازیر، آویزان.
**سەرەوژوور**: *sarawžur* روو لە ژوور. سربالایی.
**سەرەوژێری**: *sarawžēri* روو لە ژێر. سرازیری.
**سەرەولێژ**: *sarawlēž* لێژایی، سەرەوخواری. سرازیری.
**سەرەولێژا**: *sarawlēžâ* لێژای، سەرە و ژوورکا، روو بە لێژی. سرازیری.
**سەرەولێژایی**: *sarawlēžâi(i)* سەرەوخواری. سرازیری.
**سەرەولێژی**: *sarawlēži* لێژایی. سرازیری.
**سەرەوخواری**: *sarawxwâri* روو لە خواری. سرازیری، رو بە پایین.
**سەرهەڵدان**: *sarhaĭdân* پەیدابوونەوە. دوبارە ظهور کردن، پیدا شدن.

**ســـــــــــەرهەڵگرتن**: *sarhaĭgerten* سەرهەڵێنان. سربرداشتن، آواره شدن.

**سەرین**: *sarin* ژوورترین، سەروو. بالاترین.

**سەرین**: *sarin* باڵشت. زیرسری، بـالش و متکا.

**سەرێن**: *sarēn* باڵشت، ژێری سەر. زیرسری، بالش، متکا.

**سـەریوان**: *sariwân* هـا. محــل جمــع آوری فضولات حیوانی در یک محل.

**سـەعات**: *saât* کاتژمـێر. سـاعت، وسـیله اندازەگیری زمان.

**سـەعات**: *sa ât* لـەش ساقی، سـەلامەتی ئافیەت. عافیت، تندرستی.

**سەعات**: *sa ât* نێـوێکی ژنــان، بەختــەوەری. ســعادت، خوشبختی، نامی زنانه.

**سەفت**: *saft* نووسین لە دەفتـەری مـیری، نووسین لە دەفتەر. درج، ثبت.

**ســـەقا**: *saqâ* ئاوکــێش. ســقا، آبکــش نانوایی در قدیم.

**سەقام**: *saqâm* بەرقەرار، جێگیر. ثبات، استقرار، جاگیر.

**ســـــەقامگیر**: *saqâmgir* دامــــەزراو، بەرقەراربوون. مستقر شده.

**ســـەقەت**: *saqat* لـــە کـــار کەوتـــە، مردارەوبوو. از کار افتاده.

**ســەقەتکردن**: *saqatkerden* لـە کـار خستن. از کار انداختن.

**ســـــەقەتکریاگ**: *saqatkeryâg* لـــــە کــارخراو، مردارەوکــراوە. از کــار افتــاده شده.

**سـەکتە**: *sakta* راوەسـتانی دڵ یـا مێـشك بـەهۆی ویـستانی خـوێن لـە بـەر گـرفتی دەمارەکـان. سکتە، آنفــارکتوس، حــالتی ناگهانی در انــسان کــه در اثــر انــسداد رگهای قلب یا مغز موجب مرگ سریع یا فلج میگردد.

**سەکۆ**: *sakō* بەرزاییيەکی دروستکراو لە خـشت بـۆ دانـشتن. سـکو، تختگـاه سـاخته شده ازخشت یا آجر.

**سـەکوت**: *sakot* تـەحر، وەکـو (تواشـاکە سەروسەکوتی). قیافه و شکل از نظر بدی و زشــتی،ماننــد (شــکل و قیافــەاش را ببین).

**ســەکین**: *sakin* ئالْبوونــەوەی دەدان لــە ڕووی کەسـێك و جنێـودان پـێی. بـە کسی پرخاش کردن.

**ســـەگ پاســـووتیاگ**: *sagpâsutyâg* ئاماژیـە بـۆ ماڵانگـەڕی سـەرخۆ. کنایـە از آدم ولگرد.

**سەگسار**: *sagsâr* جنوێکە، وەك سەگ. سگ سار، مانند سگ.

سـەگمەرگی: *sagmargi* ئـازار و دەردی زۆر لە ژیاندا. مـشقت زنـدگی، درد و رنـج زنـدگی.

**سەگوســـووتگ**: *sagusuteg* ســـەگ و بێـچووەکان. ســـگ و تولـــه هـــایش، اصطلاحی کنایەای.

**ســـەگەوان**: *sagawân* خـــاوەن ســـەگ. سگ بان، صاحب سگ، سگ باز.

**ســـەگەوەڕ**: *sagawaŕ* دەنگـــی چـــەند سەگ پێکەوە. عوعو دسته جمعی سگ.

**سەلاخ**: *salâx* کەسێك کە لـە قەسابخانە ئـیش دەکـا. سلاخ، کسی کـه در کشتارگاه پوست حیوانات کشته شده را می‌کند.

**سەڵت**: *saĭt* تەنیا، عەزەو، بێ ژن. تنها، مجرد.

**ســەڵتە**: *saĭta* جلـێکە لــە ســەر کــەوای دەکـەن. نـیم تنـەی کوتـاه کـه روی قبـا پوشیده می‌شود.

**سـەلك**: *salek* بـنی گیـا، هەرشـتێکی خـڕ هەڵـدراوی، بـۆ ژمـاردن بــە کـار دەڕوێ. مقـدار، واحـد شمـارش بـرای تـرب و پیـاز و....

**ســـــەلکە**: *salka* هەرشتـــــێکی خـــــڕ هەڵـدراوی، پـڕ بـە مـشت واحـد شمـارش برای پیاز و ریشه گیاهان مشابه.

**ســـەلکێ**: *salekē* بـــنی خـــڕ کـــراوەی سروشـتی گیـا، وەکـو پیـاز. واحـد شمـارش برای پیاز، ترپ و....

**ســـــەلماندن**: *salmânden* ســــەپاندن. قبولاندن به هر دلیل مناسب.

**ســــــەلمانن**: *salmânen* قبووڵانـــــدن، سـەلماندن. قبولانـــدن بـــا زور و اکـــراه از جانب طرف مقابل.

**سـەڵوات**: *saĭawât* سـەڵوات. صـــلوات، درود، تحیت.

**ســـەڵوات ئـــاوا**: *saĭwât âwâ* نـــێوی گوندێکـــە کـــە جـــێگای لـــەدایکبوونی گۆرانیبێــژی بــە ناوبــانگی کــورد ســەید عەلی ئەزغەر کوردستانییە. صلوات آباد، نام روستایی در حومه شهر سنندج کــه محل تولد خواننده بلند آوازه کُرد ســید علی اصغر کردستانی بوده است.

**سەڵیتە**: *saĭita* ژنی بێ شەرم و حەیا. سلیته، زن بد کاره و بی‌حیا.

**سەم**: *sam* ژار. زهر، ماده کشنده.

**سەماوەر**: *samâwar* سـەماوەر. سماور، وسیله مخصوص جوش آوردن آب.

**ســـەمۆر**: *samōr* ســـەمۆرە. ســــــمور، جانوری گوشتخوار با جثه‌ای کوچک کــه پوست آن قیمتی است.

**سەمۆرە**: *samōra* سەمۆر. سمور.

**سەمەر**: *samar* بەر، حاسڵ. ثمـــر، بـــر، بار، دست آورد.

**سەمەرە**: *samara* بـەر، حاسڵ. ثمـــره، بازده.

**سـەمەنی**: *samani* گـەنمی چـێنراو لـە نێو دەفر بۆ ڕسمویاسای نـەورۆز. ســبزە، سمنو، گندم سبز شده مخــصوص عیــد نوروز و سفره هفت سین.

**سـەنان**: *sanân* سـەندان. ســــندان، از آلات مخصوص آهنگری.

**سەنای مـەکی**: *sanaymaki* سـەنامەکی چەشنێ گیایە. گیاهی سهل و تلخ مزه.

**ســەندن**: *sanden* کـــڕین، ئەســـتاندن. خریدن، گرفتن، خرید کردن.

**ســەنگە**: *sanga* ســەندوویە، کڕیوویــە. گرفته، خریده.

**سەنگەر**: *sangar* جێگای خۆپاراستنی سەربازان بۆ بەرگری لە مەیدانی شەڕدا، جێگای بەرخۆدان، مەتەرێز. سنگر، جان پناه، محل محافظت جنگاوران از دید و تیر دشمن.
**سەنگەکی**: *sangaki* نانێك كە لە تەنووری ڕێخ بىرژدرێت. نان سنگك.
**سەنگەڵی**: *sangaĭi* سەندەڵی، كورسی‌ی دانشتن. صندلی، چهارپایە پشتی دار كە روی آن می‌نشینند.
**سەنگین**: *sangin* قورس. سنگین، وزن‌دار، پر وزن، وزین.
**سەنن**: *sanen* كڕین، سەندن. خریدن، گرفتن، خرید كردن.
**سەنیاگ**: *sanyâg* سەندراو، سنراو. خریداری شده، معامله شده.
**سەنێر**: *sanēr* سنێر، سەرین. سرگین، مدفوع حیوانات اهلی.
**سەنێرپێژ**: *sanērpēž* ئەوەی كە سەنێر بۆ تەپاڵە دەپێژێ. كسی كە تاپالە می‌سازد.
**سەوا**: *sawâ* توانای، خوێندنەوە و نووسین. سواد، توانایی خواندن و نوشتن.
**سەوا**: *sawâ* نەخۆشییەكی دەروونییە. سودا، بیماری مالیخولیا و خیالباف.
**سەوادار**: *sawâdâr* كەسێك كە خوێندن و نووسین بزانی. باسواد، كسی كە توانایی خواندن و نوشتن را داشته باشد.
**سەور**: *sawr* سەبر. صبر، تأمل، طاقت.
**سەوز**: *sawz* كەسك، ڕەنگی سەوز. سبز، هر چیز كە بە رنگ برگ درخت و گیاه تازه باشد.
**سەوزایی**: *sawzâi(i)* شینكە، ڕەنگی سەوز، گیای سەوزی دەشتودەر. سبزرنگی، زمین سبز و خرم، رنگ چمنراز، سبزه زار.
**سەوزبوون**: *sawzbun* ڕوانی ڕووەك. رستن گیاهان، سبز شدن.
**سەوزكردن**: *sawzkerden* ڕواندنی ڕووەك، چاندنی ڕووەك. رویانیدن، سبز كردن.
**سەوزە**: *sawza* شینایی دەشتودەر. سبزه گون، سبزه.
**سەوزەپۆش**: *sawzapōš* گەڕەكێكە لە شاری سنە. سبزەپوش، نام محلەای در سنندج مشرف به بلوار كردستان
**سەوزەكەوا**: *sawzakawâ* سەوزەكۆ، مەلێكی تەواو شین. سبزە قبا، نام پرندەای است.
**سەوزەڵانی**: *sawzaĭâni* سەوزایی، سەوزەزار. سبزه زار، زمین سبز و خرم.
**سەوزەڵێ**: *sawzaĭē* سەۆزەڵە. سبزگونه.
**سەوزی**: *sawzi* گیای دەستچن بۆ خواردن، ڕەنگی كەسك. رنگ سبز، سبزی خوردن، سبزی.
**سەوقات**: *sawqât* دیاری، پێشكەشی. رهاورد، ارمغان.
**سەوقاتی**: *sawqâti* شتی تایبەت بە دیاری، پێشكەشی، قەرتاڵەی مێوە.

رهاورد، سبد دست بافتـه از جـنس چـوب برای حمل میوەجات.
**سەوڵ:** *sawĭ* داری سەوڵ. درخت سرو.
**سـەوڵان:** *sawĭân* هـا، گیـای گوڵپـەڕ کـە چەشنێ ترشی لێ دروست دە کرێ. گیـاه گلپر، که دارای خارهـای ریـز است و از آن جهت ترشی استفاده میکنند.
**سـەوەتە:** *sawata* سـەبەت. سـبد چـوبی دست بافت.
**سەیــر:** *saēr* عــەجایبات. غـیر معمـول، عجیب.
**سەیر:** *saēr* گەڕان و تماشا کردن، دتـین. گردش، تماشا، دیدن.
**سەیـران:** *saērân* گـەڕان و تماشـاکردن. گردش کردن.
**سەیرانگا:** *saērângâ* جێگای سەیران. تماشاگه، گردشگاه.
سەیـــــــــــرانگاگەل: *saērângâgal* سەیرانگاکان. تماشاگاه ها، گردشگاه ها.
**سەیـره:** *saēra* مەلـێکی بـچووکی خـۆش خوێن. سهره، سیره، پرنده ای کوچک با صدای خوش و پرهای سبز، زرد و قرمز.
ســــەیزاده: *sayzâda* ژنــــی ئــــەولادەی پێغەمبەر. زن سیده.
**سەیی:** *sai(i)* سەید. سید، بزرگ، مهتر، آقا، اولاد حضرت محّمد (ص).
**سێ:** *sē* ژماره ۳. عدد سه.
**ســی:** *si* ژمـاره ۳۰، سـی سـیڵ. عـدد ۳۰، ریه، شش.
**سیابازی:** *siyâbâzi* فێڵبازی. سیه بـازی، حقه بازی، شیادی.
**سیابەنی:** *siyâbani* فریوکاری. ســرهم بندی کــردن کــاری بــه منـــظور کــلاه برداری، شیادی، فریبکاری.
**سیاچەمانە:** *siyâčamâna* مەقامـێکی گـۆرانیی هـەورامی. مقـامی در موسیقی هورامی.
**سیار:** *sayâr* یاریدەر، هاریکار، کومەك. کمك، کمك کننده، شاگرد.
**سیازاخ:** *siyâzâx* زاخی ڕەش. زاج سیاه.
**سیاسـاڵ:** *siyâsâĭ* سـاڵی بـێ بـاران. سـال بی باران، خشکسال.
**سیاسەران:** *siyâsarân* نـێوی گونـدێکە، سەر ڕەشان. سیه سران، محلی که تپه ها و ارتفاعات آن به علت کمبـود علـف و گیـاه به رنگ سیاه باشد، نام روستایی است.
**سیامالٚ:** *seyâmâĭ* ڕەش ماڵ.

کزەی ڕەشە بای هەناسان سەرد
سیاماڵ عەیش تەختە تەختە کەرد
(مەولەوی مەعدوومی)

چادر سیاه عشایر.
**ســیان:** *siyân* ســیان، یــەك و دوو. ســه عدد.
**سیانگزە:** *seyângza* ژمارەی ۱۳. عدد سیزده.
**ســــــیانگزەبەدەر:** *seyângzabadar* ڕەسمووياســــــای رۆژی ســــــیزدەی دوای نـەورۆز. سیزده بدر، مراسم روز ســیزده بدر درماه فروردین که بر اســاس ســنت تاریخــی برای دور کردن مــصائب ســال آتــی برگزار می شود و ایرانیان باســتان معتقد بودند که این روز نحس است لــذا با سرور و شادی آن را برگزار می‌کردنــد

عامه مردم (درسنندج)پس از پایان روز، سیزده عدد سنگ ریزه را به علامت رفع نحسی روز سیــزده تک تک از پشت سر پرتاب می کنند و به آن نگاه نمــی کننــد زیرا معتــقدند که در صورت نگــاه کردن به مسیرسنگها نحــسی و بــلا دامنگیــر آنان خواهد شد.

**سیانه**: *seyâna* سیانی. سه عدد است، سه تایی.

**سیاوڵه**: *siyâwĭa* سیاوڵه تۆوی گیایەکە بەم نـێوە. ســیاهدانه، شــونیز گیــاهی خودرو دارای برگهای باریــک و گلهــای زرد یا بنفش و دانه‌هــای ســیاه رنــگ و خوشبو اســت کــه درپخــت نــان مــورد مصرف است.

**سیاهه**: *siyâha* پیرست، لیسته.
سیاهه، لیست، فهرست.

**سیایی**: *siyâi(i)* ڕەشایی، ڕەشی، ڕوو بــە ڕەشــی نــانی شــەو. ســیاهی، رنــگ رو بــه سیاهی گرایده شده

**سیپاڵ**: *sipâĭ* کۆنه و پەڕۆی دڕاو، ڕیپاڵ و سـیپاڵ. پارچه کهنه، گلیم ساده و کــم عرض کنایه از آدم شلخته و بی‌نظم.

**سێ جاره**: *sējâra* سێ وەختە، سێ کاتە. سه‌باره، بار سوم.

**سیچکه**: *sička* سیچك. ثمر گیاهی شبیه مازوج که در دباغی مورد مــصرف قــرار می‌گرفت.

**سێخ**: *sēx* ئامرازێکی نووك تیـژ تایبـەتی گوشت برژاندن (شیش). سیخ، شئ بلند و نوك تیز از جنس فلز که گوشت را بــه آن می‌کشند و کباب می‌کنند.

**ســێخدان**: *sēxdân* جـێگای ســێخ. ســیخ زدن.

**سێداره**: *sēdâra* داری ئیعدام، دارقەواخ. چوب اعدام، دار اعدام.

**سیر**: *sir* کێشکه بەرانبەر بە ۷۵ گرام. سیر، واحد وزن برابر ۷۵ گرم.

**ســیر**: *sir* گیایــەکی بــۆن تونــدە کــە خواردنی بە کاری دەرمانی دێت. گیــاهی مشهور که خاصیت درمانی زیادی دارد.

**سیرخن**: *sirxen* لاسار. لجوج.

**ســیروان**: *sirwân* نـێوی ڕۆخانەیــەکی بەناوبانگە. نام رودخانه‌ای در کردستان.

**ســێ ڕۆژه**: *sērōža* ڕەسمویاســای ڕۆژی ئاخری مـردوو. سـەروزه، مراسـم سـەروزه برای فوت کرده.

**سیرەمۆزه**: *siramōza* سووره مۆزه.
زنبور بزرگ نیش دار که بدن آن به رنگ قهوه‌ای و خط‌های زرد رنگ است، نــوع سیاه رنگ آن نیز وجود دارد.

**سێڕیان**: *sēŕeyân* ڕێگایەك که سێ ڕێی لێ دەبێتەوە. سه راهی، محل تلاقی سه راه.

**سیرێــك**: *sirēk* یــەك ســیر بەرانبــەر بــە گرم. یك سیر، برابر گرم.

**ســــێژەمە**: *sēžama* ســــێ وەختــــەی خواردن. سه وعده غذا.

**سیس**: *sis* ژاکاو، مرۆڤی لاواز. پژمــرده، پلاسیده، کنایه از شخص لاغر و نحیف.

**ســیس**: *sis* نـێوی گــوندێکە لـە دەشتــی (لەێلاخ) کە لە بـاری مێژووییەوە بـەناو بانگە. نام روستایی در منطقه دهگلان و

دشت (لیلاخ) که از قدمت تاریخی زیادی برخورداراست.

**سیسبوون**: *sisbun* ژاکاو، لاواز بوون. پژمرده شدن، پلاسیده شدن، پژمردن

**سیسرك**: *siserk* نێوی مێرووییەکە. جیرجیرك، یکی از انواع حشرات.

**سیس عەمەر**: *sis amar* سووسەنبەر. سوس عنبر، سوسنبر، گیاهی است شبیه نعناع دارای برگهای خوشبو و گلهای سفید مایل به سرخ، سینبر.

**سیسۆڵ**: *sisōĭ* مرۆڤی لاواز، ژاکاو، لاواز. پژمرده شده، لاغر، نحیف.

**سیسۆڵە**: *sisōĭa* مرۆڤی لاواز، ژاکاو، لاواز. پلاسیده شده، پژمرده شده، کنایه از آدم لاغر و مردنی

سێسووچ: *sēsuč* سێگۆشە. سه گوش.

**سیسەر**: *sisar* نێوی چەند لووتکە کێوە لە ناوچەی لەێلاخ. سی سر، نام چند قله کوه در شرق سنندج و وجه تسمیه روستای (سیس) که گویا (بلاذری) جهانگرد معروف در کتاب خود از آن یاد کرده است.

**سیسی**: *sisi* ژاکاوی. پژمردەگی، چروکیدەگی، پلاسیدەگی

**سیسیاگ**: *sisyâg* ژاکینراو. پژمرده شده، پلاسیده شده.

**سیسیان**: *sisyân* سیسبوون. پژمرده شدن، پلاسیده شدن.

**سێشەمە**: *sēšama* سێشەمە، رۆژی چوارمی حەوتە. سەشنبه روز چهارم هفته.

**سێف**: *sēf* سێو. سیب، محصول درختی به همین نام.

**سێف زەمینی**: *sēfzamini* سێف زەمینە، یارەڵماسی. سیب زمینی، یکی از محصولات پُرمصرف که دارای ارزش غذایی زیادی است.

**سێفە سوورە**: *sēfasura* سێوی سوور، سێوە سوورە. سیب سرخ.

**سێکوچکە**: *sēkočka* سێ بەردی ئاوردان. سه سنگی، سه سنگ اجاق، سه پایه.

**سیم**: *sim* تالی زیو یا هەرچەشنە کانزایەکی تر. سیم، رشته های باریك حامل الکتریسته، و هر مفتول باریك دیگر.

**سین**: *sin* (س) یەکی لە پیتەکان. (س) یکی از حروف الفبا، پسوند به معنی گیرنده.

**سینە**: *sina* سینگە، سینگ. سینه، قسمت جلو بدن انسان بالای شکم و محل پستانها و استخوانهای جناغ.

**سینەبەن**: *sinaban* سینگبەند، سوخمە. سینه بند، پیش بند.

**سینەپالوو**: *sinapâlu* نەخۆشیی سی. سینه پهلو، ذات الریه.

**سینەپۆش**: *sinapōš* سینگ پۆش، جلی نیمە قەدی ژنانەیە نیم تنه زنانه.

**سینەرێز**: *sinarēz* ها. زیورآلات سینه، نیم تنه زنانه که زیورآلات بر روی آن دوخته می شده.

**سینەکێش**: *sinakēš* هەوراز. سربالایی کوه، سینه کش، جای مسطح که خورشید بر آن بتابد.

**سینەمەلە**: *sinamala* شێویەك لەمەلە. شنای سینه یکی از انواع شیوەهای شنا در آب.

**سینەوبەر**: *sinawbar* بەروسینگە. بر و سینه، هیکل، قد و قواره.

**سینی**: *sini* دەفری تایبەت بو چاهێنان. سینی، ظرف مسطح و لبه دار برای حمل وسایل پذیرایی.

**سیواك**: *siwâk* ها، مسواکی چێوی بۆ خاوێنکردنەوەی ددان. مسواک چوبی مخصوص پاک کردن دندان.

**سێ و دوو**: *sēwdu* ئەم وشەیە بۆ شککردن بە کار دێ. تردید وشك کردن.

**سێوەختە**: *sēwaxta* سێ جارە، سێ کاتە. سه وعده صبح، ظهر، شب.

**سێوەر**: *sēwar* سێبەر. سایە، سیاهی جسم انسان یا هر چیز دیگر که در برابر آفتاب یا نور چراغ بر روی زمین یا هر چیز دیگری بیفتد.

**سێوەرەکان**: *sēwarakân* سێبەرەکان. سایەها.

**سیویاگ**: *sewyâg* سواو. سابیده شده

**سێیەك**: *sēyak* یە لە سێ/ یك سوم.

# ش

**شا**: *šâ* شا، پاوشا، سوڵتان. شاه، پادشــاه، سلطان.

**شا**: *šâ* دڵخۆش، بەکەیف. شاد، دلخوش.

**شــا**: *šâ* تماشــا، بنــوارە، وەکــو (شــا ئــەو باڵایە). نگاه کن، تماشا کـن، ماننـد (بنگـر چه قد رعنایی دارد).

**شــاباجی**: *šâbâji* بــە خوشــکی گــەورە ئەوترێ بۆ ڕێزنان. شاباجی، کلمـه احـترام به خواهر بزرگ و خواهر شوهر.

**شـــــاباز**: *šâbâz* بـــــازی گـــــەورە و دەسەڵێنکراو کە بـەڕەنگی سـپییە. شهباز، بــاز سـفید و بـزرگ، نـوعی از بـاز قـوی پنجـەی اهلـی شـده کـه آن را بـرای شـکار تربیت می کنند.

**شـابال**: *šâbâĺ* ها، پـەڕی گـەورە، شـەپر. بزرگترین پر از پرهای بال مرغ.

**شــابۆ**: *šâbō* باڵندەیــەکی ڕاوکــەرە. شــاه بوم، یکی از پرندگان شکاری.

**شــابوون**: *šâbun* دڵخوشـبوون، بەکـەیف بوون. شاد بودن، شادمان بودن.

**شابە**: *šâba* شـاد ببـە. شـاد بـاش، خـوش باش.

**شابەنەر**: *šâbanar* کونسوول، نوێنەری وڵاتانی بیانی. کنسول، شاه بنـدر، نماینـده تجاری و بازرگانی کشور خارجی.

**شـابەنەرخانە**: *šâbanarxâna* جـێگای نوێنەرانی دەوڵەتی بیانی، جـێگایەك بـەم نـێوە لــە گـەڕەکـی ئاغــە زەمــان شــاری سنــە کــە کونـسوولی دەوڵەتی عوسمـانی لەوێـدا ژیــاوە.کونـــــسولگری دولـــــت عثمانــی، محلـــی به همین نام واقــع در محله قدیمی آقا زمان سنندج.

**شاپەڕ**: *šâpaŕ* ها، پەڕی گەورە، شەپر. بزرگترین پر در بال پرندگان.

**شاپەســەن**: *šâpasan* نــێوی گوڵــێکە، نێوی کانییەکە لە داوێنی کیوی (بەدر) لە شاری قوروە. شاه پسند، یــک نــوع گــل زینتی با رنگهــای ســفید، زرد، ســرخ و بنفش که برگ‌های بیضی شــکلی دارد و آنرا در باغچــه مـــی کارند، نام چشمه ای با آب گوارا در دامنـــه کوه (بدر) واقع در جنوب غربی شهرستان قروه.

**شاتان**: *šâtân* جەڕدان، توندبەستنەوە. جردادن، محکم بستن.

**شــاتانن**: *šâtanen* زیرانـدن بــە دەنگـی بەرز. جیغ بزرگ کشیدن.

**شــاتر**: *šâter* ئــەوەی کــە نـان دەپـێژی. شاطر، کسی که در نانوایی نان بــه تنــور می‌چسباند.

**شاتر**: *šâter* ئەو کەسـەی کـە پیـشەنگی سپای ئەمیران بـووە. شــاطر، کــسی کــه جلودار پیاده سپاه امیران بوده.

**شاتوو**: *šâtu* گاتوو، یەکێ لـە جۆرەکـانی توو. شاه توت، یک نوع توت ســیاهرنگ که برگهای آن شبیه قلب اســت و کمــی مزه ترش دارد.

**شاتوشووت:** *šâtušut* شاته شات. هو، جنجال، تعریف کردن دروغین.

**شاته:** *šâta* نانی تەندووری. نان لواش خانگی.

**شاتەڕە:** *šâtaŕa* گیایەکە بەم نێوە. شاه تره، گیاهی با برگهای ریز و کشیده شبیه گشنز با گل‌های به رنگ سرخ و بنفش که در بیابان و صحرا روئیده می‌شود و مصرف دارویی دارد.

**شاتەوکولێرە:** *šâtawkolēra* نانی تەندووری دووجۆر. به دو نوع نان خانگی لواش و گرده اتلاق می گردد.

**شاتیمان:** *šâtimân* رستەی باوەڕ بە خودا و پەیغەمبەری خودا. اشهد، شهادتین.

**شاجوان:** *šâjwân*زۆر جوان. زیباترین، جوان زیبا، جوان رعنا.

**شاخ:** *šâx* بەردی سەرچیا، چیا بەردین. شاخ، ستیغ کوه.

**شاخ:** *šâx* شاخی حەیوان. شاخ حیوان.

**شاخان:** *šâxân* نەعرە، زیڕەی گەورە. فریاد خشمناک، صدای مهیب.

**شاخان:** *šâxân* شاخانی کێو. ستیغ کوه.

**شاخانن:** *šâxânen* شاخاندن. صدای مهیب، با خشم فریاد زدن.

**شاخاوی:** *šâxâwi* چیای بەردین. کوهستانی پُر ستیغ.

**شاخدار:** *šâxdâr* حەیوانی شاخدار، خاون شاخ. شاخدار، حیوان شاخدار.

**شاخ و داخ:** *šâxudâx* شاخوداخ. بەو کۆسەی هەجیج بە شاخانەوە داخت هاوەبان گشت داخانەوە کوه و کمر.

**شاخە:** *šâxa* لە دەنگەکان، دەنگی ترەکین، شریخەی بەرز. از اصوات، مانند صدای خشم آگین و انفجاری، صدای مهیب.

**شاخەوان:** *šâxawân* کێو پێو، کوهنورد. صخره نورد.

**شادانە:** *šâdâna* گیایەکە لە سەرچڵە گوڵدارەکانی مادەی سڕکەر وەکو بەنگ و حەشیش وەدەست دێنن. شاهدانه، گیاهی یکساله که از سر شاخه‌های گلدار آن بنگ و حشیش تولید می‌کنند.

**شار:** *šâr* شار. شهر، دیار، بلد.

**شاران:** *šârân* ها، چەند با ژێڕ، با ژێڕان، شارگەل. شهرها، بلاد.

**شاربەدەر:** *šârbadar* دەرکراو لە شار، ڕاونراو لە شار. از شهر رانده شده، نفی بلد شده.

**شاردن:** *šârden* بەنهێنی قایمکردن. پنهان کردن، مخفی کردن.

**شاردنەوە:** *šârdenawa* شاردن، کاری نەهینیکردن. مخفی کردن، پنهان کاری، پنهان کردن.

**شارسان:** *šâresân* شاری گەورە. شهرستان، شهر، مرکز شهر.

**شارسانی:** *šâresâni* خەڵکی شار. شهری، شهرستانی.

**شـــارك**: *šârek* نـــاوی گوندێـــکه. نـــام روســتایی در حومــه ســنندج بــر ســر راه روستای (نەڕان).

**شارنشین**: *šârnešin* ئەوەی کە لە شاردا دەژی. شهرنشین، اهل شهر، شهری.

**شارۆ**: *šârō* کۆکردنەوەی خەڵە و مێوەی بــەجێ مــاو. خوشـــه‌چینـــی، چیـــدن باقیمانده های محصول از درخت وجــین آخر.

**شـارودێ**: *šârudē* شـار و گونـد. شـهر و روستا.

**شـــارەبانی**: *šârabâni* پولیـــسی شـــار. شهربانی نام قدیمی نیرو لی انتظامی.

**شـــارەدار**: *šâradâr* شـــارەوان. شـــهردار، مسئول اداره شهر و خدمات شهری.

**شارەداری**: *šâradâri* شارەوانی. شهرداری.

**شارەزا**: *šârazâ* زۆر زانا. آگاه، بلد، دانا.

شـــارەگ: *šâŕag* شـــاڕەگ، ڕەگـــی گـــەورە، شادەمار. شاهرگ، ورید بزرگ.

**شــاره مرۆچــه**: *šâramerōča* شــاری مـــێلووره، هـــێلانەی مـــێلووره. لانـــەی مورچگان.

**شـاره و شـار**: *šârawšâr* شـار بـه شـار گـەڕان. شـهر بـه شـهر، از شـهری بـه شـهر دیگر.

**شـاری**: *šâri* خـەڵکی شـار. شـهری، اهـل شهر.

**شـاریاگ**: *šâryâg* شـاردراو. پنهـان شـده، مخفی شده.

**شاڕێگه**: *šâŕēga* ڕێگای گەورە. شـاه راه، بزرگ راه.

**شازاده**: *šâzâ* دال مهملـه، منـداڵی پادشـا، فەرزندی شا. شاهزاده، فرزند شاه.

**شاژن**: *šâžen* ژنی سەر، ژنـی سـەرە، ژنـی شـا، ژنـی بـەژن و بـاڵا جـوان. زن شـاه، زن برتـر، زن زیباروی و خوش اندام.

**شاســــــوار**: *šâsawâr* شۆڕەســــــوار، سوارچاك. شهسوار، شاه سـوار، سـوار دلاور و چالاك.

**شاســەلیمبازی**: *šasalimbâzi* جــۆری شانۆی کۆنی ئیرانی. خیمه شب بازی.

**شــاف**: *šâf* شــیاف، شــاف، دەوایەکــە بــۆ ڕەوان بوون بە کاری دەبن. شیاف، داروی جامد و مخروطی شکل که برای معالجــه بیمارانی که دچاریبوست شــده باشــند تجویز میگردد.

**شــافعی**: *šâfei* امــامی شــافعی ڕێــبەری مەزهـەبی شـافعی. شافعــــی، یکـــی از مذاهب چهــارگانه اهل سنت منسوب به ابو عبدالله محمّــد بــن ادریــس شــافعی (۱۵۰متولد، ۲۰۳وفات ه.ق) و یکی از ائمه چهارگانه اهل سنت که اکثریـت مــردم کُرد پیروایشان هستند.

**شاکار**: *šâkâr* کاری گەورە، کـاری مـەزن. شاهکار، کار برجسته و نمایان.

**شـاکەر**: *šâkar* شـادی هـێنەر. شـاد کـن، شادی آور.

**شاکەشـاك**: *šâkašâk* هەڵسوکەوتکردن. افتان و خیزان.

**شـــاگرد**: *šâgerd* بەردەســـتی وەســـتا. شاگرد، کسی که نزد استاد مشغول آموزش است.

**شـاگردانە**: *šâgerdâna* مـزی شـاگرد. انعام شاگرد.

**شـاگوڵ**: *šâgoĭ* گـوڵی گـەورە و جـوان. بهترین گل، کلمه احترام آمیز خطاب به خواهر بزرگ.

**شاگەشە**: *šâgaša* شادمانی، خۆشیی زۆر بە هۆی کەیفخۆشییەوە. شادمانی بـسیار، شکوفا شده.

**شـاڵ**: *šâĭ* پـشتوێن. شـال، پارچـه باریـك دستباف محلی کردی هورامی.

**شـالا**: *šâlâ* نـێویك بـۆ ژنـان و کـچان، شەهلا. شهلا، نام زنانه

**شالاو**: *šâĭâw* ها، پەلامار. هجوم، حملـه، یورش ناگهانی.

**شـــالووت**: *šâlut* ئـــەوەی کـــە لـــووتی گەورەیە. دمـاغ بـزرگ، کنایـه از کـسی کـه دارای دماغی بزرگ باشد.

**شام**: *šâm* شێوی شەو. شام، وعده غذای شب.

**شامار**: *šâmâr* ماری گەورە. مار بزرگ.

**شـــامی کـــەواو**: *šâmikawâw* شـــامی کەباب. کباب، شامی که بـا گوشت کوبیـده و آرد نخودچی می پزند.

**شان**: ***šân*** نێوان قۆڵ و گەردن، لووتکەی بەردینی کێو. کتـف، شـان و شـکوه، تـراش کوه.

**شاناز**: *šânâz* نـێوێکە بـۆ کـچان و ژنـان، نـێوی یـەکێ لـە دەسـتگاکانی مۆسـیقای ئـێرانییە. شـهناز، نـام زنانـه، نـام یکـی از دستگاههای موسیقی ایرانی.

**شـــانازی**: *šânâzi* پـــێ بـــاڵین، تـــاریفی هۆکـاری خـۆکردن، پـێ نـازین. افتخـار کردن، مباهات کردن، فخر کـردن، نازیـدن به چیزی.

**شانبەشـــــان**: *šânbašân* پێکــــەوە. دوشادوش.

**شـان داچـەکیاگ**: *šândâčakyâg* شـان داچەماو. شانه آویخته شده.

**شـــان داخـــستن**: *šândâxesten* شـــان داهێنان. شـانه انـداختن، خـم شـدن، کـوم شدن.

**شـــاندان**: *šândân* پاڵنـــان. شـــانەدادن، لمیدن.

**شـــان داهێـــشتن**: *šândâhēšten* شـــان داهێنان، شان داخستن. راضـــی شـــدن در برابر انجام کاری که مورد تمایل نیـــست، کنایه از زیر بار رفتن، تسلیم شدن.

**شانــشین**: *šânešin* تـــەلار لـــە خـــانووی قەدیمی‌دا، نێوی گوند و کێوێکە. تـالار در عمارت‌های قدیمی، نام روستا و کوهی.

**شانگزە**: *šângza* شازدە، ژمارەی ١۶. عدد شانزده ١۶.

**شانوباشـــیل**: *šânubâšil* دەســـتوباهوو. یخت و لباس، اصطلاحی کنایه آمیز دال بر ریخت وقیافه نامرتب.

**شـــــانوباهوو**: *šânubâhu* شـــــانوبازوو. قسمت ساعد، بازو و کتف در انسان.

**شان و شکۆ**: *šânušekō* قەد و باڵا. شأن و شکوه، بروبالا، قد و قامت.

**شـانه:** *šâna* وەکـو شـانه هەنگوێـن یـان هێلکه. شانه، واحد شمارش تخـم مـرغ، هر شانه برابر با ۳۰عدد تخم مرغ اسـت، یک قطعه عسل در کندو.

**شانه:** *šâna* ئەوەی که مـووی سـەری پـێ دادەهێنن، لێواره شان. شانه، کتف، شانەی موو، کناره.

**شـــانه:** *šâna* ئـــامرازی تایبـــەت بـــه داهـێنانی مـووی سـەر. شـــانه مخـــصوص مرتب کردن موی سر.

**شانەکریاگ:** *šânakeryâg* شانەکراو. شانه شده.

**شـانەکەر:** *šânakar* ئـەوەی کـه مـوو دادەهێنێ. شانه زن.

**شانەوشان:** *šânawšân* ئـەم تەنیـشت و ئـەو تەنیـشت کـردن. بـه پهلـو غلتیـدن. تواشا شانه و شان.

**شـاواش:** *šâwâš* شـاباش، خەڵاتـدان بـه گۆرانیبێژ له کاتی هەڵپەڕکێدا. شا بـاش، خلعتدادن به مطرب، خوش باش.

**شاهۆ:** *šâhō* نێوی چیایەکی سـەربەرزه لـــه هەورامانـــدا کـــه چـــەند لووتکـــەی بوڵەندی هەیـه. شاهو، نـام کوهستانی در اورامان که چندین قله مرتفع دارد.

**شـای:** *šâi* دڵخۆشـی، بەکـەیفی، شـادی. شادی، خوشحالی، شادمانی، جشن سـرور و شادی.

**شایانه:** *šâyâna* جێژنی شایی. مجلـس شادی جمعی به مناسبت خاصـی ماننـد برآورده شدن حاجات.

**شای مارگـەل:** *šâymârgal* شـای مـاران لـه چـیرۆکاندا. شـاه مارهـا در داسـتانهای فولکلوریك.

**شایەت:** *šâyat* شایەد، شەهاد، شاهید. شاهد، گواه.

**شـایەت:** *šâyat* ئەشـێ، وەکـو (ئەوگوڵـه شایەت لەو گوڵەبچێ) شاید، ممکن، ماننـد (ممکـن اسـت آن گـل شـباهتی بـا آن گـل داشته باشد).

**شـــایەتی:** *šâyati* شـــەهاده، شـــاهدی، گواهی.

**شـایەتیدان:** *šayatidân* شـایەدیـدان. گواهی دادن، شهادت دادن.

**شـــــایەتیمان:** *šâyatimân* ڕســــــتەی شەهادەت بەخوداو ڕەسـوولی خـودا. کلمـه اشهد، شهادتین.

**شـایی:** *šâi(i)* پادشـاهی، شـایی. شـاهی، بزرگی.

**شپرز:** *šeperz* پرزنه، شلخته، بی نظـم، نامنظم، آدم بی‌نظم.

**شپرزه:** *šeperza* پەرژ و بـلاو. شلخته، آشفته، بی نظم.

**شپرزیاگ:** *šeperzyâg* شپرزراو. آشفته شده، نامرتب شده.

**شدرەم:** *šadara* کێشیکه. واحـد وزن در قدیم.

**شـرقه:** *šarqa* لەدەنگـەکان. از اصـوات، مانند صدای کوبیدن سنگ بـه شیـشه، صدای شکستن شیشه یا اشیاء مشابه.

**کولـــێره**: *kolēra* کولـــێره، نانـــێکی تەندووری. نان گرده تنوری.

**کولـــــێره چــــەوره**: *kolēračawra* کولـێرەی چـەورکراو. نـان گـرده روغـن مالیده شده.

**کولــــێره مەژگـــــە**: *kolēramažga* کولێرەیەك كە كاكڵە گوێزی تێ کرا بێ. نان گرده مخلوط با مغز گردو.

**کولێن**: *kolēn* جێگای مریشك، هێلانەی مریشك. لانه مرغ و خروس.

**کـوڵین**: *koĭin* جۆشـان، وەجـۆش هـاتن. جوشیدن، عمل جوشاندن.

**کـۆم**: *kōm* کـۆم، پـشت چـەماوه. کـوم، خمیده پشت، کوژپشت.

**کۆمـاج**: *kōmâj* خانۆچـکەی سـەر بـان. کماج، اطاقک منتهی به بام خانه.

**کۆمـایین**: *kōmâin* نـێوی گوندێـکە لـە رۆژهەڵاتـی شـاری سنە سـەر بـە کامیـاران و ناوچەی کولیـایی. نام روستایی از توابع کامیاران که به سبب زیارتگاهی در آن از معروفیت خاصی برخوردار است.

**کۆمبوون**: *kōmbun* پشت چەمانەوه. خم بودن، خمیده بودن، کوم بودن.

**کۆمبوونـــــەوه**: *kōmbunawa* پـــــشت چەمانەوه، دانەوین. خم شدن.

**کۆمەڵە**: *kōmaĭa* گرووپێك لە خەڵك. جمع کوچك، محفل کوچك.

**کۆمـەوبـووگ**: *kōmawbug* کۆمـەوکـراو، چەماوه. خمیده شده.

**کۆمـــــــەوکریـــــاگ**: *kōmawkryâg* کومەوکراو، چەمراو. خمیده شده.

**کۆمی**: *kōmi* نشیمەنگا. معقد.

**کونا**: *konâ* کون، رۆچنە. روزنه، سوراخ، منفذ.

**کونـا گـورگ**: *konâgorg* کونـە گـورگ. لانه گرگ.

**کونـج**: *konj* سـووچ، قـوژبن، وەکـو (لـە کونجـێکا بـۆ خـوەم سـەقام بگـرم). کُـنج، گوشه، زاویه، مانند (درگوشەی برای خود آرام بگیرم).

**کـونجی**: *konji* دانەوێڵەیەکـە زۆر ورد کە ڕۆنی لێ دەگـرن. کنجـد، دانــەهـای چرب از گیاهی به همین نام، در ســنندج نوعــی شیرینی بــه شــکل لــوزی از آن درست می کنند که از معروفیت خاصــی برخوردار است.

**کۆنــە**: *kōna* دێـرینە، قـەدیمـی. کهنـە، قدیمی، کارکرده.

**کۆنــەپۆش**: *kōnapōš* کەسـێ کـە شـتی کۆنە دەپۆشی. کهنه پوش.

**کۆنەپوشی**: *kōnapōši* نێـوی هۆزێـکی کــورده. کهنــه پوشــی، نــام عــشیرەای در کردستان .

**کۆنەپـــەرەس**: *kōnaparas* بـــڕوا بـــە بیروبـاوەڕی کـۆن. کهنـه پرسـت، مرتجـع، واپسگرا.

**کۆنـەچاڵ**: *kōnačâĭ* چاڵەکۆن. چــال حفرشده قدیمی، اصطلاحی کنایەای بــه کسی که چیزی را درجایی سراغ داشته باشد.

**کووجی**: *kuji* کۆڵان. کوچه، راه عبور و مرور، معبر.

**کووچه**: *kuča* کۆڵان. کوچه، راه عبور و مرور.

**کـوودەری**: *kudari* جـۆرە کووتاڵێکـە. پارچه کوردی از جنس نخ و گلدار.

**کـووره**: *kura* کـووره، لوولـه بڵێنـدی دووکـێش. کـوره، آتـشدان، جـای گـداختن آهن یا شیشه.

**کـــووره پەزخانــــه**: *kurapazxâna* ئاجۆرپەزی، کوورەی خـشتی سـوور. کوره آجرپزی، جای پختن آجر.

**کوورەخانــه**: *kuraxâna* ئاجۆرپــەزی. کوره آجرپزی، جای پختن آجر.

**کووز**: *kuz* جۆگەی ئاوی بێستان، جۆگەی بچووکی پای داری مێو. جوی پـای رسـتنی جالیز، شیارجالیز.

**کووز**: *kuz* کۆم. کوژ، قوز.

**کووزەڵە**: *kuzaĺa* ها، گیایەکە لـە ئـاودا دەڕۆی و تـامی تونـده. ترتیـــزک آبـــی، گیاهی است یکساله که طعم آن تند و از سبزی های خوردنی است و در کنارەهای جوی آب می‌روید.

**کووزی**: *kuzi* دەفری تایبەت بـە ترشـی و ڕۆن که له هۆمە بـچووکترە. کوزه، ظــرف سفالی بدون دسته کوچکتر از خم.

**کووژەکـه**: *kužaka* مـووروویـەکـی شـین یـان سپی رەنگـه. خرمهـره آبـی یـا سـفید رنگ که در فرهنگ عامه بـرای جلوگیری از چشم زخم مفید است.

**کووفـەکووف**: *kufakuf* نـاڵین و گرمۆڵـه بوون بەهۆی سـەرمـاوه. آه و ناله از فــرط سرمازدگی و مچاله شدن از فرط سرما.

**کوولەکــه**: *kulaka* کوولەکــه، کــەدوو. کدو، از انواع محصولات کــشاورزی کــه مصرف خــوراکی دارد و تخــم درون آن پس از برشته شدن قابل مصرف است.

**کوولەکه سەراویی**: *kulakasarâwi(i)* کوندر، کدو، کولەنده. کدو سرابی، یکی از انواع کدو.

**کۆوەوبــوون**: *kōwawbun* کۆبوونــەوه. جمع شدن، گردآمدند، اجتماع کردن.

**کـوێ**: *kwē* کـوێ، کـام جـێ. کجـا، کـدام محل؟.

**کوێر**: *kwēr* کەسێ که له دیتن بێ بـەش بێ، بێچاو. کور، نابینا.

**کوێـرا**: *kwērâ* کوێـری، وەکـو (کوێـرایی داهاتن). کوری، مانند (کور شدن).

**کوێـــربوون**: *kwērbun* بـــێ ســـۆمای چاوبوون. کورشدن، نابینا شدن.

**کـوێردڵ**: *kwērdeĺ* ناتێگەیـشتوو. کـور دل.

**کوێــرەدێ**: *kwēradē* گونـدی بـچووک، کۆرەدێ. روستای کوچك و دور افتاده.

**کوێرەڕێ**: *kwēraŕē* بزنەڕێ، کـۆرە ڕێ. راه باریك، کوره راه.

**کوێره ڕێگا**: *kwēraŕēgâ* ڕێگای تەسك. کوره راه، راه مال رو.

**کوێـــره ڕێـــگه**: *kwēraŕēga* ڕێـــگای دوورەدەس و تەسـك. راه باریـك مـال رو، کور راه.

**کوێرەکـوێر**: *kwērakwēr* بـه کوێـری کارکردن. کورمال کورمال.

**کوێـــــــــــرەوبووگ**: *kwērawbug* کوێرەوکراو. بسته شدن سوراخ بەتدریج.

**کوێـــــــــــرەوبوون**: *kwērawbun* کوێـرکردنەوەی دواجـارە. مـسدود شـدن تدریجی.

**کوێرەوکردن**: *kwērawkerden* بەستن و پرکردنـەوە ڕێـگای هەرشـتیکی. مـسدود کردن، پرکردن.

**کوێـرەوەری**: *kwērawari* ڕەنجـەڕۆیی. رنـــج ومـــشقت، تحمـــل رنـــج ومـــشقت، بیچارەگی.

**کوێـنە**: *kwēna* کـوێ، کـام جـێگا، وەکـو (بـــۆ کوێـــنە ئـــەڕوی). کجـــا، کجاســـت، مانند(به کجا می روی).

**کوییَ**: *kweyē* کوێنە، کام جێ، وەکو (بـۆ کـوێ ئـەڕۆی). کجـا، ماننـــد(بـــه کجـا میروی).

**کــەبادە**: *kabâda* ئامــێریکی وەرزشـی زۆرخانــەیی. کبـاده، یکـی از ادوات ورزش باستانی شبیه به کمان از جنس آهن.

**کــەپر**: *kaper* خانۆچـکەی دروســتکراو لەدار و گەڵا. کپر، آلاچیق.

**کـــــەپۆڵ**: *kapōĭ* پـــــۆزە، برتیەلـــــە دەمولووت. بینی، قسمت برجـسته جلـو صورت.

**کەپەکەپ**: *kapakap* دەنگی نـاڕەسـەنی قسەکردن. اسم صوت، صدای حرف زدن نامفهوم.

**کەپەنك**: *kapanak* فـەرەنجی، نـەمـەد. روکش نمدی.

**کـەت**: *kat* هـا، تـەختی داریـنی لـە سـەر نووسـتن و دانـشتن. تخـت چـوبی بـرای خوابیدن ونشستن.

**کەتان**: *katân* نێوی گیایەکە کـە کوتـاڵی لێ دروسـت دەکـرێ. کتان، گیاهی با ساقه بلند که در آذربایجـان و سـواحل خـزر روییده میشود و از آن پارچه می بافند.

**کەتانە**: *katâna* ناوێکە بـۆ ژنـان، نـێوی هەوایەکـە لـە موسـێقای کوردیـدا. آهنگـی کُردی، نامی زنانه (کتانه).

**کــەتمان**: *katmân* چاوپۆشـین، حاشـا، ئینکار. کتمان، انکار، حاشا.

**کــەتوکوڵفت**: *katukoĭofet* زۆرکڵفـت، زەبـەلاح. کت و کلفت، ضخیم، درشـت و بدشکل، لندهور.

**کەتـە**: *kata* برنجـی دەمکـراو. بـرنـج دم کرده، کته.

**کەتـە**: *kata* ژووری تایبـەت بـە ئـارد لـە نانەواخانــەی نــانی ســەنگەکیدا. محــل نگهداری آرد در نانوایی سنگکی.

**کەتەپلاو**: *katapeĭâw* برنجی دەمکراو. کته، دم پخت برنج.

**کەتیبە**: *katiba* بـەردەنووس، نووسـراوە خـشتی کـۆن، تـاقی سـەر دەرگـا. کتیبـه، سردرب آجری و نوشتەای کـه روی سـنگ یا آجر نقش کرده باشند.

**کـەتیرە**: *katira* شـیرەی گـەون. کتیـــرا، صمغ یا شیرەی گیاه (گون)کــه مـصرف صنعتی دارد.

**کەتیرەکــەن**: *katirakan* کەســێك کــە پیشەی ودەستهێنانی شیرەی گەونە. کسی که کار او یافتن وگرفتن صــمغ کتیــرا از بوته گون است.

**کەچەڵ**: *kačaĭ* سەری بێ مـوو، کەسێك کە تووشی مەرەزی کەچەڵی بـووە. کچل، کسی که موهای سر او بــر اثــر بیمــاری کچلی ریخته باشد.

**کەچــەڵە**: *kačaĭa* ســواویی کوتــاڵوو ڕاخـەر. زدەگــی، ســاییده شــدن مــثلاً ساییدگی قالی و پارچه.

**کەچــەڵی**: *kačaĭi* نەخۆشــیی پیــستی سـەر. کچلی، کسی که موهای سرش بــر اثر بیماری کچلی ریخته باشد.

**کەر**: *kar* ها، وڵاخ. خر، الاغ، از حیوانـات بارکش و اهلی.

**کەڕ**: *kaŕ* نەژنەوە، گوێ کپ. کر، ناشنوا.

**کەڕاکە**: *kaŕâka* بن گوی. بنا گوش.

**کەرامـــــەت**: *karâmat* جوامــــێری و گەورەیی، کاری ئـەولیا و خاسانی دەرگای حــــەق لــــە زاری خەڵکــدا. کرامـــــت، جوانمردی و بزرگــی، در اصطلاح عامــه عمــل خــارق العــادەای کــه از اولیــاء و صالحین دیده می شود.

**کەرانە**: *karâna* کرداری بێ ئاوەزانە. خریت، مزد حماقت.

**کەرایەتی**: *karâyati* کـردەوەی کەرانـە. خریت، حماقت.

**کەربوون**: *karbun* کەسێك کـە کـردەوی کەرانەی هـەبێ. خربودن، شخص احمق و بی شعور.

**کەرتەشــی**: *kartaši* گیایــەکی دڕکـداری سەرخڕە. گیاهی با ساقەی بلند و سـرگرد وتوپی با خار زیاد.

**کــەرجۆ**: *karjō* نــێوی گوندێــکه لــه باشووری شاری سـنه و لەداوێـنی کێوە بـه ناوبانگەکـەی عاشـقان نــام روستــایــی در حـــومه شهـــر سننـــدج و دامـــنه کـــوه عاشقان.

**کەرچـەك**: *karčak* نێـوی گیـا و ڕۆنــی گیایەکە. گیاه کرچک، گیاهی بــا ســاقه بلند که مسهلی قوی اســت و در طــب و صنعت از آن استفاده می‌شود.

**کەرخنکـــــێنە**: *karxnkēna* نــــێوی گیایەکە. گیاهی است خودرو با ساقه هـای کوتاه و پڕ شاخه و برگهای سوزنی وگلهای سفید رنگ ریز.

**کــەرخول**: *karxol* مــزرەق، مەزرێــق. گـردنای، وسیله بازی بچگـانه که با شـلاق پارچەای آنـرا به چرخش درآورند.

**کەرخەســێن**: *karxasēn* ئاماژەیــە بــۆ کەسی بەهێز. کنایه از آدم پڕ زور.

**کــەردز**: *kardez* کەسێ کـە دزی کـەرە. دزد خر یا الاغ، خردزد.

**کــەرزۆر**: *karzōr* پــڕ بــه زۆر. پــر زور، کنایه از آدم پڕ زور، خر زور.

**کەرســواری**: *karsewâri* ســواری بــە ئولاخ. الاغ سواری.

**کــــەرکردن**: *karkerden* کـــەرکردن، فریودان. کنایه از فریب دادن کسی.

**کـەڕکـردن**: *kaŕkerden* لـە بیـستی بـێ بەشکردن. ناشنوا کردن، کر کردن.

**کـەرکوژە**: *karkoža* نـێوی گیایەکـە. خرزهره، گیاهی کوهی کـه نـوعی ازآن را پـرورش مـی‌دهنـد و دارای گلهای سـرخ و سفید است.

**کـەرکوڵ**: *karkoĭ* بێـچووی ئـوڵاخ. کُـره الاغ.

**کـەرکوڵ**: *karkōĭ* جنـێوێکە، وڵاخـی بـێ دووچـك. کُـره خـر، خـر بـی دم، نـوعی دشنام است.

**کـــەرکوڵ**: *karkoĭ* نـــێوی گیایـــەکی چقڵدارە. یکی از انـواع گیاهـان خـاردار و خودرو.

**کەرگـەدەن**: *kargadan* زینـدەوەرێکی زل و شـاخدارە. کرگـدن، حیـوانی قـوی هیکل که در جنگل زندگی می‌کند و علف خوار است.

**کەرلەوەڕێـن**: *karlawarēn* ئـەوەی کـە کەر بۆ لەوەڕین دەبا. خر چران.

**کـەروگا**: *karugâ* حـەیواناتی گـەورەی بەخـێوکراو وەکـو کـەروگا. الاغ و گـاو، کنایه از آدم بی شعور.

**کـــەڕ و لاڵ**: *kaŕulâĭ* کەســـی کـــە نەدەبیسێ نە قسە دەکا. کرولال، کسی کـه از شنوایی و گویایی محروم است.

**کەرە**: *kara* کەرە، ڕۆنی قاڵنـەکراو. کره، یکی از محصولات لبنـی و پُرچـرب کـه ازترکیـب آب و ماسـت یعنـی دوغ بـه دست می‌آید.

**کەڕەپوو**: *kaŕapu* کوڵکی گوڵی قـامیش، کوڵکی داری بـی. کرکهای گُل نی که ثمـر گیاه نی است، پرزهای بید نر.

**کـەرەپیاگ**: *karapeyâg* جنیـوێ کـە ئاماژەیە بوپیـاوی قەڵەو بـێ ئـاوەز. مـرد قوی هیکل، کنایه از آدم قوی هیکل و بـی شعور.

**کەرەفتوو**: *karaftu* ئەشکەوتـێکی کـۆنی مێژوویی لە دەوروبـەری شاری سـەقز کـە پەرسـتشگای میترایییـەکان بـووە. کرفتـو، غاری تاریخی در کردستان که محرابـه و نیایـشگاه مـذهبی میتـرا پرسـتان از مـذاهب کهـن و تـاریخی مـردم ایـن سرزمین بوده است.

**کەرەلیاس**: *karalyâs* جارچـی، ئـوڵاخی نـێو چیرۆکـێکی کـونی فولکلورلیـك. جارچـی، خـر الیـاس، برمبنـای داسـتانی کهن.

**کـــەرەم**: *karam* بەخـــشین، لوتـــف، گەورەیی کردن. کرم، بخشش.

**کەرەمـــدار**: *karamdâr* بەخشـــێنەر، جوامێر. بخشنده، سخی.

**کـــەرەمکار**: *karamkâr* جوامـــێر، بەخشێنەر. نیکوکار، بخشنده.

**کەڕەنا**: *kaŕanâ* دووکەلکێشی سەماوەر. دودکش سماور یا اجاق.

**کـەڕەنـا**: *kaŕanâ* شـەیپووری گـەورە. کرنا، یکی از انواع سازهای بادی.

**کەرەنتوو**: *karantu* چەشـنێ داسی دەم پان و درێژ وەکو شمـشێر وایـە. داس بلند درو، شبیه شمشیر که با آن محـصولات کشاورزی مانند گندم را درو می‌کنند.

**کەڕەواڵە:** *kaŕawâĭa* کەڕەوانە، چەشنێ باڵندەیە وەکو مـراوی. بلـدرچیـن، کـنایە از آدم سادە لوح و دست و پاچلفتی.

**کـەڕەوڵ:** *kaŕaweĭ* کـەڕۆ. کپک، کفک، نوعی از قارچ کە روی نان ماندە و بعضی از غذاها میرويد.

**کەڕی:** *kaŕi* گوێ کپی. کری، ناشنوایی.

**کەری:** *kari* کـردەوەی کەرانـە، کـردەوەی دوور لە عەقڵ. خريت، حماقت، ابلهی.

**کەژاڵ:** *kažâĭ* ڕەنگی مەیلەو ڕەش. رنگ سیاه مایل بە آبی، نامی برای زنان.

کەژیکەران: *kažykarân* کەژەوان، نێوی گوندێکـە. کوهنوردان، کوه پیمایان، نـام روسـتایی، ایـن واژه بـسیار قـدیمی و پرمعنا است اما اکنون مصطلح نیست.

**کەس:** *kas* خزم، تاکێ لە مروڤـ. کـس، شخص، فامیل، خویش.

**کەسـات:** *kasât* بـێ ڕەواج. کـساد، بـی رونق، ناروراج.

**کەساتی:** *kasâti* نـارەواجی. کسادی، بـی رونقی، نارواجی بازار.

**کەسـاس:** *kasâs* پەرێـشان، دڵـەودوا، پەشێو. پریشان حال، آشفتە، نگران.

**کەسـان:** *kasân* خزمـان، خـەڵکان، چەندکەسی تر. اشخاص، اقوام، کسان.

**کەسـپ:** *kasp* کـسب، داهـاتی ڕۆژانـە. کسب، حاصل کردن، بە دست آوردن.

**کەسـکون:** *kaskon* چـێژی تونـد و خەسـت، زۆرشوێـندانەر. تنـد مـزه، بـسیارمؤثر، بـسیارتأثیرگذار و کـاری، کنایە از بوی بسیار بد و تند.

**کەسل:** *kasel* ناخۆش، بەدحاڵ، بێ حاڵ، سست. کسل، سست، ناتوان، کاهل، بیحـال، ناخوش.

**کەسـم:** *kasem* خزمـی مـن، خۆشەویستم. کس من، فامیل من.

**کەسنەزان:** *kasnazân* نێوی گونـدێکی بەناوبانگە. نام روستایی معروف.

**کەسـنەناس:** *kasnanâs* غـەریب، نەناسـینەوەی دۆسـتان ویـارانی قـەدیمی. کنایە از آدمی کە وضعیت مالی او بهتـر شدە و دوستان قدیمی خـود را بـە جـا نمیآورد.

**کەسـوکار:** *kasukâr* خزمووکـار، خزموقەوم. قوم و فامیل، کسوکار، اقوام.

**کەسـەر:** *kasar* خـەم، خەفـەت، کەسار. اندوه، غم، غصە.

**کەسـێ:** *kasē* مروڤـێك، ئاماژەیـە بـۆ کەسی نادیار. کسی، شخصی، فردی.

**کەشـاو:** *kašâw* جەعبـەی مـێزی نووسین. کشو، جعبە میز.

**کەشتی:** *kašti* پاپۆڕ، کشتی. کـشتی، از وسایل نقلیە کە روی آب حرکت کنـد و ازآن برای حمل بار و مسافر بـە صـورت انبوه استفادە می شود.

**کەشـتیلە:** *kaštila* کـەوچکی دارینـەی گەورەی تایبەت بـە خـواردن، دەسـتکردی هـەورامان. قاشـق بـزرگ، ملاقـە بـزرگ چوبی کـە یکی از دست سازهای معـروف اورامـان اسـت و دارای نقـش و نگارهـای زیبایی است.

**کەشـك**: *kašk* چەشـنێ پـێخۆرە کـە لـە کوڵاندنی ماست و دۆ ساز دەکرێ. کشک، جوشانده ماسـت یـا دوغ از محـصولات لبنی.

**کەشـــکۆڵ**: *kaškōĭ* دەفتـــەری شـــیعر، دەفری دەروێشان. کشکول، دفتـر شـعر، ظرفی که درویشان به شانه یا دست می آویزند.

**کەشکەسـەرە**: *kaškasara* سـەرمازەڵە، کچکە قوولە، گیاندارێکە. نـوعی چلپاسـه، نوعی مارمووك.

**کەشـــــکەتونە**: *kaškatona* جــــۆرێ شـیرینیی سـپی ڕەنـگ بـەتـامی تونـد و شیرین. نوعـی شیرینـی سنتـی سفید رنگ، کشك خشك که ترکیبی از شکر و نعنـاع و اسانسی گرمازاست.

**کەشـــکەڕەقـــە**: *kaškaŕaqa* بڕوانـــە کەشکە تونە. نگاه (کەشکە تونە).

**کەشـــکەزرانی**: *kaškazrâni* کاســـەی ئەژنۆ. کشك زانو، استخوان سر زانو.

کەشــکەك: *kaškak* چەشــنێ چێــشت. نوعی غذای سنتی که ترکیبی ازگنـدم، گوشت گاو، نمک و آب است.

**کەف**: *kaf* کەف، وەکو کەفی سابوون. کف، مانند کف صابون.

**کـــەفارەت**: *kafârat* تۆڵـــەی تـــاوان. کفـاره، صدقــه، آنچه که بــه وسیله آن گناه را بپوشانند.

**کەفارەتدار**: *kafâratdâr* ئەوکارەی کـە پێویستی بە دانـی کـەفارە هـەبێ، مرۆڤـی پـیس. کنایــه از آدم بد یُمن، کـاری کــه لازمه آن دادن صدقه باشد.

**کەفاو**: *kafâw* کەفی سابوون لەسەر ئاو. کـف آب، مخلـوطی از آب و مـاده کـف کننده مانند صابون.

**کەفاوی**: *kafâwi* کەف و ئـاوی تـێکەلاو. کف آلود.

**کەفتار**: *kaftâr* کەمتیار. کفتار، حیوانی درنده شبیه سگ که پوستی تیره و خالدار دارد.

**کـەفتگ**: *kafteg* کـەوتوو. افتـادن، بـر زمین خورده شده.

**کەفتن**: *kaften* کـەوتن. افتـاده، بـرزمین افتادن، زمین خوردن.

**کەفتنــــــە خـــــوار**: *kaftnaxwâr* بەربوونــەوە بــۆ زەوی، کەوتنــە خــوار. افتادن به پایین.

**کەفتنە سەر**: *kaftenasar* کەوتنەسەر، بەربوونەوە بۆسـەر. بـالا افتـادن، بـه فکـر افتادن درباره چیزی.

**کەفتنــــە لا**: *kaftenalâ* کەوتنــــەلا، بەرەولا کـەوتن. بـه پهلو افتـادن، در کنـار رفته.

**کەفتنــــەوە**: *kaftenawa* ســــەرلەنوێ کەوتن.دوباره افتادن.

**کەفتوو**: *kaftu* کەوتبوو، وەکو (خاڵۆم لە نـاو جـێگا کـەفتوو). افتـاده بـود، زمـین خـورده بـود،ماننـد (دایـی مـن در بـستر افتاده بود).

**کەفتەکار**: *kaftakâr* لاکەفتە، ئیفلیج. ازکار افتاده، زمین گیر، مفلوك.

**کەفتـەیی**: *kaftai(i)* جـۆری نەخۆشـیی لـەش (تیفوئیـد). بیمـــاری حـــصبه یـــا

تیفوئید، بیماری واگیردار و میکروبی بە نام (باسیل ابرت).

**کەف چڕین**: *kafčeŕin* کەف لەسەر لێوهێنان. کف برلب آوردن.

**کەف چەلین**: *kafčalin* کەف پڕژانن. کف‌آوردن بر لب، کف چریدن.

**کەف ڕێژ**: *kafřēž* کەسێ کە بە هۆی نەخۆشییەوە کەف لە لێوی دەڕێژێ. کف ریز، کف زا.

**کەفگن**: *kafgen* کەوتوون. افتاده اند، اصطلاحی کنایه‌ای برای جا خوش کردن.

**کەفگە**: *kafga* کەوتووە، وەکو (ماشینەکە کەفگە). افتاده است، به زمین خورده است، مانند (آن ماشین چپ شده است).

**کەفوکوڵ**: *kafukoĭ* کەفی سەر چێشت. کف روی گوشت پخته یا هرغذایی دیگر.

**کەفەڵ**: *kafaĭ* سمت، نەرمایی سەرپشتی ران. باسن، کفل.

**کەکرە**: *kakra* نێوی گیایەکی زۆر تاڵە. گیاهی است بسیارتلخ.

**کەڵ**: *kaĭ* بزنە کێفی، نێری گاو گامێش. بزرگ، کل کوهی.

**کەل**: *kal* پارچە شکاوی شتێك وەکو پەڕیوەی پەرداخ یان نیم شکاوەی دنان. خورده‌گی و پریده‌گی شئ مانند لیوان یا ظرف چینی یا نیم شکستگی دندان.

**کەل**: *kal* گەردەنە، ڕێگایەکی سەخڵەتی کێوسانی. گردنە، راه صعب العبور کوهستانی.

**کەل**: *kal* نیاز، پێویست. نیاز، احتیاج.

**کەلاج**: *kalâj* ئامێرێك لە ئۆتۆمبیلدا. کلاج، دستگاهی کە با بکار انداختن آن قدرت دورانی موتور را به چرخها انتقال می‌دهد.

**کەلارە**: *kalâra* دەفرێکی دروستکراو لە رنج ولاس. ظرفی کە از سرگین خشک شده ساخته می‌شد و مخصوص حمل و نقل خاکستر و زباله بود.

**کەلاش**: *kalâš* کەسی فێڵباز. کلاش، حقه باز، شیاد، نیرنگ باز.

**کەلاك**: *kalâk* لاشە، جەستە. لاشە، جسد، کنایه از هیکل لش.

**کەلاکەل**: *kalâkal* ئاوات خواستن بۆ ڕۆیشتن و نەگەڕانەوە. کنایه از کسی کە در حال رفتن است، بە امید برنگشتن وی، نفرینی است.

**کەلام**: *kalâm* وتەی گەورەکان. کلام، گفته، فرموده، فرمایش.

**کەلانتەری**: *kaĭântari* دایرەیەکی پولیس لە گەڕەکێکدا. کلانتری، یکی از شعبات پلیس برای حفظ نظم و امنیت جامعه در یک محله و کوی.

**کەلانە**: *kalâna* نانێکی ساجی تێکەڵاو لەگەڵ تەرە پێواز و کەرە، ئەم نانە تایبەتە بە بەوەرزی بەهار.
نوعی نان که ترکیبی از پیاز سبز و تازه و کره حیوانی است و بیشتر در فصل بهارآنرا تهیه می‌کنند.

**کەلاوە**: *kalâwa* جێگایەکی ڕووخاو، کاول. ویرانه، خرابه، مخروبه.

**کەلاێکەل**: *kalâēkal* بڕوانە (کەلاکەل) نگاه (کەلاکەل)

**کەلایی:** *kalâi(i)* کەسێك کە لە زیارەتی کەربەلا گەڕابێتەوە، جێگای کەلکراو. کسی کە بە زیارت کربلا رفتە باشد، افتادەگی قسمتی از دیوار یا دندان.

**کەڵبە:** *kaĭba* کەڵوە، پۆزە. قسمت جلوی صورت حیوانات.

**کەڵپوس:** *kaĭpōs* پۆستینی دەرۆیشان. پوستین درویشان کە از پوست حیوانات درست شدە است.

**کەلتەشی:** *kaltaši* گیایەکی چقڵداری سەر خڕ. گیاهی است با ساقە بلند و سرشاخەای توپی خاردار.

**کەڵك:** *kaĭk* پاساروسەربان. دیوار و بام خانە، قرنیزدیوار.

**کەلکردن:** *kalkerden* بڕینەوەی بەشێك لە شتێ و ناقزمان. قسمتی از چیزی را بریدن یا کندن.

**کەڵکوبان:** *kaĭkubân* پاسار و سەرووی خانوو. دیوار و بام خانە.

**کەل کەفتن:** *kalkaften* کەل کەوتن، بەنیاز بوون. نیاز پیدا کردن، احتیاج پیدا کردن.

**کەڵکەڵە:** *kaĭkaĭa* خولیا، ئارەزوو، ئیشتیا. آرزو، اشتیاق، اشتها، هوس.

**کەڵکیت:** *kaĭkit* کەرکیت، شانەی پۆ و تاڵی قاڵی. شانە، پود کوب قالی ازجنس فلز و شانە مانند با دستەای کوتاە.

**کەڵگرتن:** *kaĭgrten* ئاوسبوونی مانگا لە کەڵەگا. آبستن شدن گاو از گشن.

**کەلەتەزێن:** *kalatazēn* سەرتەزین بەهۆی خواردنەوەیەکی سارد کە لەبەر ساردی سەر بتەزێنی. کنایە از خوردن آشامیدنی سرد و گیج شدن سر، آنچە کە موجب گیج شدن سر می‌شود.

**کەل لێکەفتن:** *kallēkaften* کەل لێکەوتن، بە نیاز بوون نیازمند کسی شدن، نیازمند شدن.

**کەلوش:** *kalōš* چەشنێ فورمی جلوبەرگی ژنانە. گرد، اشارە بە نوعی برش دامن زنانە.

**کەلۆکە:** *kalōka* پارچەیەك خشتی سوور یاخە کە لە بیناسازیدا وەکار دەکرێ. قطعەای کوچک از خشت یا آجر در بنایی.

**کەلوپەل:** *kalupal* ئەسپابی ماڵ، شڕە و پڕە. خرتوپرت، اسباب وسایل متفرقە.

**کەلوکۆم:** *kalukōm* لار و ناڕاست. کج و کولە، ناهموار، نامنظم.

**کەڵوە:** *kaĭwa* کەڵپە، دانی پێشین لە زیندەوەران. دندان پیش حیوانات، پوزە حیوانات.

**کەلە بێژنگ:** *kalabēžng* کەلە بێژنگ. دورچوبی غربال و سرند.

**کەلەپاچە:** *kalapâča* خواردەمەنییەکە لە سەر و پێی کۆلاو. کلە پاچە، نوعی غذاسنتی.

**کەڵەپیاگ:** *kaĭapeyâg* کەڵەپیاو، پیاوی ئازا و جوامێر. مرد بزرگ، مرد قوی و نیرومند.

**کەڵەشاخ:** *kaĭašâx* شاخی تایبەت بە حەجامەت گرتن. وسیلە حجامت کە از جنس شاخ حیوانات بزرگ است.

**کەلـەرم**: *kalarm* کەلـەم. کلـم، یکـی از انواع سبزیها.

**کەلەڕەش**: *kalaŕaš* قالاو، ئاماژەیـە بـۆ مروڤـی بـێ ئـاوەز. سرسـیاه، کنایـە از آدم بی شعور.

**کەلـەزات**: *kalazât* ترسـەنۆك، ترسـە زاور. بزدل، ترسو.

**کەلەشەق**: *kalašaq* لەنجباز، کەلـەڕەق. لجباز، لجوج، کلەشق.

**کەڵەشێر**: *kaĭašēr* کەڵەباب. خروس، از طیور و مرغان خانگی.

**کەڵەشـێرباز**: *kaĭašērbâz* ئـەوەی کەڵـەباب رادەگـرێ و بەخـێوی دەکـا. خروس باز، کسی کە بە خـروس علاقمنـد اسـت و آن را بـرای بـازی خـروس جنگـی تربیت میکند.

**کەلەقـەن**: *kalaqan* کەلەقـەن، قەنـدی کەلە. کلە قند.

**کەڵەك**: *kaĭak* دەغەڵ، فێڵ. کلك، حقە.

**کەڵەکباز**: *kaĭakbâz* دەغـەڵباز، فـێڵباز. کلك باز، حقە باز، شیاد.

**کەڵـەك لـێدان**: *kaĭaklēdân* دەغـەڵ لێدان. حقە زدن، کلك زدن.

**کەلەکـە**: *klaka* ئیـسقانی سـەری خاڵێگا یا هاڵێگا. استخوان سر تهیگاه در انسان.

**کەلکـەنوو**: *kalkanu* ئاماژەیـە بـۆ جێگایەکی دوور لە دید و شاراوە. کنایە از جای دور افتادە و پرت.

**کەڵەگا**: *kaĭagâ* گای نـێری گـەۆرە. گـاو نر تنومند.

**کەلەگەرم**: *kalagarm* سەرقاڵ، بریتیە لە مروڤی تووڕە یـا مەسـت و سـەرخۆش. سرگرم، کنایە از آدم عصبانی و مست.

**کەلـەلا**: *kalalâ* شـەکەت، مانـدوو، پەریشان حاڵ. داغان، متلاشی، بدحال هم معنی میدهد.

**کەلـەلا**: *kalalâ* بـەرباو، داغـان، ناسـۆر. درب و داغان، لت و پار، بدحال.

**کـەلهوڕ**: *kalhoŕ* نـێوی هۆزێـکە کـە لـە پارێزگای کرماشـان دادەژیـن. کلهـر، نـام عشیرەای درکرمانشاە کە یکی ازطوایف بزرگ و پُرجمعیـت بـا سـابقە تـاریخی است.

**کەلـەوەر**: *kalawar* کـەلیی شتـێك، مەودای جیابوونـەوە لـە نـێوان دوو بـەش لـە شتـێك. لـب پریـدگی شـئ، فاصـلە افتادگی.

**کەڵهـێڕ**: *kaĭhēŕ* تیـسمیڕیاگ، هـێرشی گشتی. کنایـە از حملـە دسـتە جمعـی بـە کسـی، کنایـە از آدم قوی هیکل.

**کەلەی شەکەر**: *kalaēšakar* ئامـاژە بـۆ مروڤی خوێـن شـیرن و ڕەزا سـووك، کەلـە شەکر. کنایە از آدم دوست داشتنی.

**کەلەیی**: *kalai(i)* نیمە شێت، سەرشێت. نیمەدیوانە.

**کەم**: *kam* نەختێ، دژی زۆر، وەکو (کـەم نەوێ فرەیش نییە). کم، اندك، مانند(کم نباشد زیاد هم نیست).

**کەما**: *kamâ* گیای کەما. گیـاهی اسـت خودرو کە مصرف دامی دارد.

**کەماجاڕ**: *kamaâjâŕ* شوێنی که کەمای زۆری لێ ڕوابێ. جایی کـه گیـاه کمـا درآن روییده باشد.

**کـەمان**: *kamân* دارێـکی نیوچـەغز کـه ژێـی تـێ خـراوه بۆتیرهاوێـشتن. کمـان، چـوبی خمیــده کــه دو ســرآن را بــا زه بکشند، آلتی برای تیرانداختن.

**کەمانــچه**: *kamânča* هــا، ئامــێرێکی موسیقـایی. کمانچه، یکـی ازآلات موسیقی که دارای سه یا چهار سیم است.

**کەمانـچەژەن**: *kamânčažan* ژەنیـاری کەمانــچه، ئــەو کەســەی کــه کەمانــچه دەژەنـێ، یـەکی لـه کەمـانـچه ژەنـه بـەنـاو بانگـەکانی شـاری سـنه (عـەلیجان) بـووە. نــوازنده کـمانــچه، از کمانــچه زن هــای مشهور در شهرسـنندج مرحـوم (علیجـان) بوده است.

**کــەمتار**: *kamtâr* کــەمتیار. کفتــار، حیوانی درنده شبیه سگ.

**کەمتەرخەم**: *kamtarxam* کارپشتگوێ خەر، کەم دەست و برد لە کاردا. لا أبالی، لا قید در کار.

**کەمتەرخــــــــەمی**: *kamtarxami* سـستیکردن لـه کاروئیـشدا. لاأبـالی گـری، لاقیدی، کوتاهی و اهمال درکار.

**کـەمتیار**: *kamteyâr* کـەمتار. کفتـار، حیـوانی درنـده و وحـشی شـبیه سـگ بـا پوست تیره و خالدار.

**کەم تین**: *kamtin* کەم گڕ. کـم حـرارت، ناتوان، گرمای اندك.

**کــەم جیقڵــدان**: *kamjiqeĭdân* بــێ حەوسەڵە، بـێ سـەبر. کنایه ازکم ظرفیت و کم حوصله.

**کەمــــچه**: *kamča* ماڵـــەی بــــەنایی، کەوچودارینه. قاشق چوبی، مالەی بنایی.

**کـەمخوەر**: *kamxwar* زۆر نـەخۆر. کـم خور، کم اشتها.

**کەمــدەس**: *kamdas* تەنگدەســت، بـێ دەسەلات. تنگدست، ناتوان، غیرچابك

کەمکردن: *kamkerdan* دزینـەوە، دژی زیادکردن. کم کردن، کاستن، کاهش دادن.

**کەمکۆڵ**: *kamkōĭ* تێکۆلی شینی گوێز. پوستەی سبز گــردو و کــه در رنگــرزی مورد مصرف است و ازآن رنگ قهــوه ای به دست می‌آوردند.

**کەموبێش**: *kamubēš* کەم تابێش، کـەم تاکورت. کم و بیش، کم و زیاد.

**کــــەم و کــــۆڕ**: *kamukōŕ* ناتـــــەواو، کەموکورت. ناتمام، ناقص.

**کەموکوڕی**: *kamukoŕi* کەموبێشی. کم و بیش.

**کەمە**: *kama* پێـچەوانە زۆرە. کـم اسـت، اندك است، قلیل است.

**کەمـە**: *kama* داری دەوری دایـره و دەف و دهـۆڵ. چـمبره، ماننـد چـمبره دایـره یـا دف.

**کەمـەر**: *kamar* ناوقـەو، ناوقـە. کمـر، میان.

**کەمەربەن**: *kamarban* پشتێن، شریتی تایبەت بەدەوری شواڵی پیاوانـه. کمربنـد،

تسمه یا نواری از چرم یا جنس دیگری که بر دور کمر شلوار می بندند.

**کەمەرە:** *kamara* نێوەڕاستی هەرشتێ. میانه هرچیز.

**کەمەکەمــە:** *kama kama* نەختــە نەختە. اندك اندك.

**کەمـــــەکێ:** *kamakē* نەختەڵەیـــەك، نەختێ، وردەیەك. اندکی، کمی.

**کەمەن:** *kaman* پەتی درێژ بۆ ڕاوگرتن، کەمەند. کمند، طناب، رشته‌ای دراز کــه برای گرفتــار کــردن حیوانــات بــه کــار می‌برند.

**کەمـــــــــەوکردن:** *kamawkerden* دزینەوە. کم کردن، کاستن، کاهش دادن.

**کـەمێ:** *kamē* وردەیـەك، نـەختێ. کمـی، اندکی.

**کەمێك:** *kamēk* نەختێك. اندکی، کمی.

**کەمــێڵە:** *kamēĭa* چـڵمی وشــەکەبووی لووت. چلم خشك شده بینی.

**کەن:** *kan* ئاودڕ. پرتگاه.

**کەن:** *kan* ها، کاری کەنـدن، وەکو (چاڵ کەن، چاکەن). پسوند، به معنی کن، مانند (حفرکن، چاه کن).

**کەن:** *kan* کەندەڵان. گودال کنارەی کوه.

کـەنار: *kanâr* قـەراخ، لا، کـەنار، لـێوار. کنار، پهلو، یك جهت چیزی.

**کەنانـــــدن:** *kanânden* وەپـــێکەنین هێنان. خنداندن، بخنده آوردن.

**کـەنانن:** *kanânen* وەپـێکەنین هـێنان. خندان، به خنده درآوردن.

**کەناو:** *kanâw* ئاودڕ. کناره آب، کنارآب.

**کەنـدن:** *kanden* دەرهـێنان، چـاڵکردن. کندن، حفرکردن.

**کــەنف:** *kanef* لــە ڕوو چــوون، خیــت بوون. کنف، خیط.

**کەنفت:** *kaneft* لـە ڕووچوون. کنفـت، خیط.

**کەنگەر:** *kangar* کنگـر. کنگر، گیــاهی است دارای برگهــای بریــده و خــاردار و ساقه‌ی سفید کوتاه که مــصرف غــذایی دارد.

**کەنگەرین:** *kangarin* چێشتی کەنگەر. خورش یا غذای ازگیاه کنگر.

**کــەنن:** *kanen* کــەنن، کەنــدن. کنــدن، حفرکردن.

**کەنوو:** *kanu* کەندوو. کندو، انبار سفالی بزرگ برای نگهداری غلات و آرد.

**کـەنووی ئـارد:** *kanuy ârd* کەنـدووی ئارد. کندو مخصوص نگهداری آرد.

**کـەنووی هەنگوێـن:** *kanuyhangwēn* کەنـدووی هەنگوێـن. کنـدوی عـسل، لانـه زنبور عسل از جنس سفال یا چوب.

**کەنەف:** *kanaf* شـەرمەزار. کنف، خجل، شرمنده، خیط.

**کەنــەف:** *kanaf* گیایەکـە بـەم نـاوە کـە کوتــاڵی لــێ دروســت دەکــری. کنــف، رشته‌های بهـم تنیـده شـده از الیـاف گیـاه کنف.

**کەنەفت:** *kanaft* شـەرمەزارکراو. کنــف شده، شرمنده شده، خیط شده.

**کەنـەکار:** *kanakâr* نـەخش کەنـدن لـە دار یان هەرشتێکی تر. کنده‌کار، کسی که

کارش حك کردن و کندن روی چوب یا فلز باشد.

**کەنـــــەکاری:** *kanakâri* نـــــەخش هەڵکەندن. کنده کاری، کنایه از آدمی که چهره آبله گون دارد.

**کەنـــەڵان:** *kanaĭân* ئـــاودڕی گـــەوره، کەندەڵان. پرتگاه کوه.

**کـەنی:** *kani* کـچه. اصـطلاحی زنانـــه مأخوذ از اورامـی خطـاب بـــه زن یـــا دختر.

**کـــەنی:** *kani* پـــێ کـــەنی. خندیـــد، او خندید.

**کەنیاگ:** *kanyâg* کەنـراو، هەڵکەنـراو. کنده شده، در آورده شده.

**کەنیـــــــسە:** *kanisa* پەرســـــــتگەی یەهوودەکان. عبادتگاه یهودیان که در شهر سـنندج دو بنـا از آن کـه محـل عبـادت یهودیان بوده است وجود دارد.

**کەنیشك:** *kanišk* کچ، کیژ. دختر.

**کەنیـشکانە:** *kaniškâna* کـچانە، وەکـو (کراسی کەنیشکانە). دخترانه، مربوط بـه دختران، مانند(پیراهن دخترانه).

**کەنیـــشکگەل:** *kaniškgal* کـــچەکان، کچگەل. دختران، دخترها.

**کەنیـشکەکان:** *kaniškakân* کـچەکان، ئەو کچانە. دخترها، آن دختران.

**کەنیشکەکە:** *kaniškaka* کچەکە، ئـەی کچە. آن دختر، ای دختر.

**کەنیشکی:** *kaniški* کچێنی، بن. دختری، بکارت دختران.

**کـەنین:** *kanin* پـێکەنین، وەکـو (کـەنین شادی تێرێ). خنده، مانند (خنـده شادی آور است).

**کـەنینی:** *kanini* پێکەنـێنی. خنـدەدار، خندەآور، کمدی.

**کـەو:** *kaw* کـەو، ژەرژ. کبـــک، ازانـــواع پرندگان وحشی که پا و نوک قرمزی بـا پرهای تیره دارد و در کوه هـای مرتفـع خصوصاً درکردستان زندگی می کند.

**کـــەوان:** *kawân* کـــەوانی ســــەرلانك، کەمانی تیر هاویشتن. کـمان، مانند کمان تیراندازی، کمان سر گهواره بچه.

**کـــەوان:** *kawân* داو، کەمـــەن، وەکـــو (لەکـەوانی دەرنـــەهات). دام، تلـه، کمنـد، مانند (او ازکمندش نرست).

**کـــەوان:** *kawân* کـــەمان، ئـــامرازێکی راوکردن و شەڕ. کمان، یکی ازآلات جنگ و شکار.

**کەوان:** *kawân* کەمان، کەوان تایبەت بە هەلاجی. کمان، کمان پنبەزنی.

**کەوانـــــە:** *kawâna* وەکـــو کـــــەوان، هەڵگەڕانەوە. کمانه، شبیه کمان.

**کەوانـــــــــەکردن:** *kawânakerden* هەڵگـەڕانـەوەی تـیر. کمانـەکردن، برگـشت گلوله.

**کـــەوانی:** *kawâni* کـــەمانی، هیلالـــی. کمانی، کمان مانند، هلالی.

**کەواو:** *kawâw* کەباب. کباب، غذایی از گوشت که برروی آتش بریان کنند.

**کەواوبـــــەڵگ:** *kawâwbaĭg* کـــەبابی گۆشتی کوتراو، جنراو. کباب برگ.

**کەواوپــەز**: *kawâwpaz* کــەباب پــەز. کبـاب پـز، کـسی کـه شـغل او کبـاب پـزی است.

**کەواوچی**: *kawawči* کەبابـچی. کبـاب پز، کبابچی، شغل مربوط به کباب، کبابی.

**کــەواو قیمــە**: *kawâwqima* کــەبابی قیمه. کباب قیمه.

**کــەواوی**: *kawâwi* کــەبابی، جــێ کــەباب دروسـت کـردن. کبـابی، شـغل منـسوب بـه کباب، جایگاه پختن کباب.

**کـــــەوباڕ**: *kawbâŕ* بێــــچووی کــــەو، کـرِبـوونی کـەو. جوجـه کبـك، کـرچ شـدن کبك.

**کـەوباز**: *kawbâz* ئـەو کەسـەی کـە زۆر حـەزی لـە کـەوە. کبـك بـاز، علاقمنـد بـه کبك.

**کەورێــــــشك**: *kawrēšk* کەروێـــــشك. خرگوش، یکی از جوندگان.

**کەوش**: *kawš* پێڵاو. کفش، پای افزار.

**کەوشـدۆز**: *kawšdōz* ئـەو کەسـەی کـە کاری پێڵاو دوورینه. کفاش، کفشدوز.

**کەوشدوور**: *kawšdur* ئـەو کەسـەی کـە پێڵاو دەدوورێنێ. کفش دوز، کفاش.

**کــەوشــەکان**: *kawšakân* پــێڵاوەکان. کفشها.

**کەوشکەن**: *kaoškan* جێگای دەرهێنانی پێڵاو. کفش کن، محلی که در آن کفش ها را از پای در آورند.

**کەوشــەن**: *kawšan* ســنووری زەویــنی گوندێـك لەگـەڵ گوندێـکی تــر. محـدوده زمینهای یك روستا با روستای دیگر.

**کەوگ**: *kaweg* ڕەنگی کەوو. رنگ کبود.

**کــەوگی**: *kawgi* بــەڕەنگــی ســورمەیی، کەووی. کبودی، خون مردگی.

**کەوگیر**: *kawgir* کەفگیر. کفگیر، قاشق بزرگ مخصوص کشیدن غذا یا اجسامی مانند زغال.

**کــەومار**: *kawmâr* جۆرێــك مــار کــە ڕەنگی بۆرە. نوعی مار خاکستری رنگ.

**کەوەرگ**: *kawarg* کـەوەر، نـێوی یـەکی لەســەوزییەکانە. تــره، یکــی از ســبزیهای خوراکی.

**کەوێڵ**: *kawēī* خانۆی چکۆلەی نێو باخ. خانه باغ، آلاچیق.

**کەهەر**: *kahar* جۆرێ نەخۆشیی پێستە، هەڵزرین. کهیر، بیماری پوستی.

**کەهــەنگ**: *kahang* نەخۆشــی و ژانــی پــشت، گـرفتی پـشت.گرفتگــی عــضلات پشت.

**کەیچ**: *kayč* هەم، تر، دیـتر، وەکـو (ماڵە کەیچ). هم، نیز، مانند (خانه هم).

**کەێف**: *kaēf* شادی، خۆشی، کەێف. شادی، خوشی، سرور.

**کەێفکردن**: *kaēfkerden* خۆشیکردن. شادی کردن، خوشی کردن.

**کـەیل**: *kayl* پـڕاوپـڕ، لێوانلـێو. مالامـال، لبریز، انباشته.

**کەێن**: *kaēn* بەین، نیوان، پێوەندی. رابطه میان دو نفر.

**کەێنوبەێن**: *kaēnubaēn* پێوەندایەتی. رابطه دو نفری، روابط.

**کەیوان**: *kaēwân* نێوی ئەستێرەیەکە. ستاره کیوان، نامی مردانه.

**کەیوانۆ**: *kaēwânō* ژنی ماڵ، هاوسەری پیاو. کدبانو، خانم خانه.

**کێ**: *kē* کام کەس، چکەس. کسی، چه کسی، چه شخصی.

**کێچ**: *kēč* جۆرێ جانەوەری خوێنمژه. کک، حشره‌ای است کوچک و بدون بال که ازخون تغذیه می‌کند.

**کێرانن**: *kēŕânen* کیرلێدان. خراش دادن، خراشانیدن.

**کێره**: *kēŕah* لە دەنگەکان. از اصوات، صدای خراش دادن.

**کێریان**: *kēryân* نێوی گوندێکە، کیرڕدران. کشیده شدن، خراش دادن، نام روستایی است.

**کیس**: *kis* فرجه. دسترسی، فرصت.

**کیس**: *kis* ماسین، وشەیەکە بۆ ماسین بە هۆی ددان ئێشانەوە بەکاردێ. آماس، بویژه برای ورم صورت ناشی از درد دندان بکار برده می‌شود.

**کیسە**: *kisa* کیسك، هەنبانە. کیسه، همیان، کیسه مخصوص حمام.

**کیسەکێش**: *kisakēš* کەسێك کە لە حەمام کار دەکا. کیسه کش و کارگر حمام.

**کیسەڵ**: *kisaĺ* کیسەڵ. لاك پشت، یکی از انواع سخت پوستان.

**کیسەوکەمر**: *kisawkamar* پشت بەندی چەرمی بۆجێگای پارە. همیان و کمر.

**کێش**: *kēš* کەش، جیر، کێش، وەکو (کێشە کە قرتیاگە). کش، مانند (آن کش پاره شده است).

**کێشان**: *kēšân* بەراورد بە تەرازوو، رەسم کردن. وزن کردن، کشیدن، ترسیم کردن.

**کێشاندن**: *kēšânden* بەراوردکردن بە تەرازوو. وزن کردن، کشیدن.

**کێشان کێشان**: *kēšânkēšân* ڕاکێشان بەزەویدا. کشان کشان.

**کێشانن**: *kēšânen* بە تەرازوو بەراوردکردن، کێشاندن. وزن کردن، توزین کردن.

**کێشانە**: *kēšâna* بە تەرازوو کێشان. وزنی، کشیدنی، توزینی.

**کێشانەوە**: *kēšânawa* سەرلەنوێ کێشان. دوباره وزن کردن، توزین کردن دوباره.

**کێشاوکێش**: *kēšâwkēš* بکێش بکێش. کشاکش.

**کێشدار**: *kēšdâr* درێژخایەن. کشدار، بلند، ممتد.

**کێشریاگ**: *kēšeryâg* کێشراو. کشیده شده، ترسیم شده، توزین شده.

**کێشك**: *kēšek* ئێشك، قەرەوڵ. کشیك، نکهبانی.

**کێشکچی**: *kēšekči* ئیشکچی. نگهبان، پاسبان، قراول.

**کێشماکێش**: *kēšmâkēš* شەڕوهەرا، دەمەقاڵە. کشاکش، جدل، تقلا.

**کێـــشمەنی**: *kēšmani* بـــە تـــەرازوو کێشران. کشیدنی، وزنی، توزین کردنی.
**کێشواکـێش**: *kēšwâkēš* کێـشانەکردنی چەند جار بەتـەرازوو. چند بار بـە طــور متوالی توزین کردن.
**کـێش و هـەوری**: *kēšuhawri* چەشـنێ پارچەیە. نوعی پارچە لباس زنانە.
**کێـشە**: *kēša* شـەڕ، گرفـت. جـدل، نـزاع، کشمکش، اختلاف.
**کێشهاتن**: *kēšhâten* لەدووهاتن. کش آمدن.
**کێشەکێش**: *kēšakēš* شـەڕوهـەرا. کـشان کشان.
**کێش هەڵکێش**: *kēšhaĭkēš* کێشماکێش. کشیدن و بالا آوردن.
**کێـشیاگ**: *kēšyâg* کێـشراو. وزن شــدە، کشیدە شدە، رسم کردە شدە، توزین شدە.
**کێـــشیان**: *kēšyân* کێـــشان. کـــشانیدن، کشیدە شدن.
**کیف**: *kif* جانتا، کیف دەستی. کیف.
**کێف**: *kēf* کیۆ، چیا. کوە.
**کێفـــسار**: *kēfsâr* کیۆســـار، کۆســـار. کوهسار، کوهستان.
**کێفـــسان**: *kēfsân* کیۆســـان، کۆســـار. کوهستان، کوهسار.
**کیفە**: *kifa* وژە کـردن وەکـو دەنگـی مـار. از اصوات، مانند صدای مار، صدای گلولە.
**کێفی**: *kēfi* کێوی، ئەوەی کە لەکێودەژی. کوهی، وحشی.
**کێفیلە**: *kēfila* کـێوی. کـوهی، آنـچە کـە در کوە میزید.
**کـێڵ**: *kēl* بـەردی سـەرمەزار. سـنگ قـبر، سنگ گورومزار.
**کێڵانـــدن**: *kēĭânden* کـاری کلـێڵدران. کارکاشتن، کاشتن بذر یا نهال.
**کـێڵانن**: *kēĭânen* کـێڵدران. کاشـــتن، افشاندن بذر.
**کـێڵگە**: *kēĭga* زەویـنی شـێوکراو، زەویـی کێڵدراو. کشتزار، کشتگاە.
**کیلوو**: *kilu* یەکەیەکی کێشانە بەرانبـەر بـــە هـــەزار گـــرام. کیلـــو، واحـــد وزن برابرهزارگرم.
**کیلووێـــك**: *kiluēk* پـــێوانەی کێـــشانەیە یەك کیلو. یك کیلو از هرچیز.
**کیلوویی**: *kilui(i)* بە میزانی یەك کیلو. کیلویی، بە وزن یك کیلو ازهرچیز.
**کـێلەکان**: *kēlakân* ئەوبەردانـەی کەلـە ســـەرقەبران دای دەنـــێن. ســـنگ قبرهـــا، سنگهای عمودی مزار.
**کێڵیاگ**: *kēĭyâg* کێڵاو، کـێڵدراو. کاشـتە شدە.
**کیمیا**: *kimyâ* هـا، کیمیـا، شـتی گـران بـا وەدەســـتنەهاتوو. کیمیــــــا، مــــأخوذ از یونانـــی بە معنـــی اختلاط و امتـــزاج، در اصطلاح امـــروز بە علـــم شیمـــــی اتـــلاق مـــی گـــردد و در اصـــطلاح عامـــە گـــران قیمت و نایاب معنی میدهد.

# گ

پیتی (گ)، وەکو (بووگ، چووگ).
پسوند فاعلی، حرف(گ) الفبا.
**گا**: *gâ* گا، جار، کەڕەت. گاه، گاو.
**گابۆڕ**: *gâbōŕ* دەنگی گا. صدای گاو، کنایه از صدای بلند.
**گاپۆس**: *gâpōs* پیستی گا، پیست کوڵفت. کنایه از پوست کلفت، پوست گاو.
**گاجفت**: *gâjeft* گاجووت. شخم زدن با گاو.
**گاراج**: *gârâj* گاڕاژ، گاڕاج. گاراژ، محل پارك اتومبیل، ایستگاه اتومبیل از نوع باری و سواری آن.
**گاڕان**: *gâŕân* نێوی ملەیە کە لە نێوان سنە و مەریوان دا. نام گردنەای بین راه سنندج و مریوان، معنای کوه را هم می‌دهد.
**گاڕانن**: *gâŕânen* گارانـدن، دەنگە دەنگی مریشك لە کاتی هێلکە کردن. صدای ممتد مرغ.
**گاڕوو**: *gâŕu* زۆر بێ شەرم. پُررو، رودار، وقیح.
**گارە**: *gâra* دەنگی مریشك. صدای مرغ.
**گارەگار**: *gâragâr* دەنگی مریشك. صدای متوالی مرغ.
**گاریە**: *gâriya* گاری. گاری، از وسایل حمل و نقل بار و مسافر در قدیم.
**گاز**: *gâz* بەددان گرتن، قەپ، ئامرازی بزمارکێشان. گاز دندان، انبر، گاز مایع یا شهری، یکی از حالات ماده، استخوان وسط پشت.
**گاز**: *gâz* قاز، مادە سرووشتی سووتەمەنی. گاز، ماده طبیعی حاصل از تجزیه نفت به صورت طبیعی.
**گاز پشت**: *gâzpešt* سەرپشت، بان پشت. گرده، سر پشت.
**گازگرتن**: *gâzgerten* بە دەدان گردن، قەپ گرتن. گاز گرفتن، با دندان فشار دادن یا گرفتن.
**گازگردن**: *gâzgerden* قەپ گرتن. با دندان نیش زدن.
**گازن**: *gâzen* ئامرازی کەوش دووری بۆ بڕینی چەرم. چاقوی مخصوص کفاشی.
**گازەگاز**: *gâzagâz* قەپ گرتن، لەدەنگەکان. گاز گرفتن متوالی، از اصوات.
**گازین**: *gâzin* گازدان بۆ تونـدروین. (بەنزین) گازدادن اتومبیل برای سرعت بیشتر.
**گاس**: *gâs* وەختی وا هەیە، ئەگەر، وەکو (گاس بێمەوە). شاید، مانند (شاید برگردم).
**گاسنۆق**: *gâsenōq* سندقی گەورەی تایبەت بە پارە و زێڕ، بەڵگە و دیکۆمێنت. گاو صندوق، صندوق بزرگ مخصوص نگهداری پول و اشیاء قیمتی و اسناد.
**گاشە**: *gâša* بەردی زەلام. سنگ بزرگ، قطعه سنگ بزرگ.

**گـاف**: *gâf* پـیتی (گ). حـــرف (گ) از حروف الفبا که گاف تلفظ می‌شود.

**گاقۆڕ**: *gâqōŕ* زل وێژ. کنایـه از گنـده گوی، صدای گاو.

**گاقۆز**: *gâqōz* زلوێژ. گنده‌گوی.

**گـاکۆتر**: *gâgōter* کـۆتره گایـه. کبـوتر چاهی، یکی از انواع کبوتر.

**گاکوچـك**: *gâkoček* گابـەرد، بـەردی زەلام. سنگ بزرگ، تله سنگ بزرگ.

**گـاکوژ**: *gâkož* کـیردی گـا کوشـتن، قەسابێك کـە گۆشـتی گـا دەفرۆشـی. گـاو کش، کارسلاخی، سلاخ گاو، قصابی کـه فقط گوشت گاو می‌فروشد.

**گاکـێفی**: *gâkēfi* کـەڵ. گـوزن، بوفـالو، حیوانی شاخدار و علف خوار.

**گاگ**: *gâg* گەدە، گەوگ. شکمبه.

**گاگا**: *gâgâ* جارجار، بەین بەین. گاه گاه، گهگه.

**گاگەل**: *gâgal* گائەل. رمه گاو، گله گاو.

**گـاڵ**: *gâĺ* نەخۆشـییەکی پێـستی. گـال، نوعی بیماری جلدی است و کـرم گـاوری هم می‌نامند.

**گال**: *gâl* گائەل. گله گاو، رمه گاو.

**گاڵ**: *gâĺ* هەرزەنـە تاڵـە. ارزن، دانـه‌هایی به رنگ خاکستری بـا بـرگ و خوشـه‌هایی شبیه خوشه جو.

**گالۆش**: *gâĺōš* چەشنی کەوشی لاسـتیکی یـا پـێلاوی لاسـتیکی. گـالش، نـوعی کفـش لاستیکی.

**گالــەوان**: *gâlawân* گاچـــەرێن. گـــاو چران.

**گامارۆ**: *gâmârō* جۆری مراویـی ڕەشـی خاڵدار. نوعی مرغابی سیاه خالدار.

**گامێش**: *gâmēš* گامووش، مانگامێش. گاومیش، حیوانی از نوع گاو اما بـزرگتر و دارای شـــاخه‌های دراز و مــــاده گـــاو آن شیرچربی دارد.

**گاواسـن**: *gâwâsen* گاسـن. گـاو آهـن، ابـزاری کــه ســر آن را بــه گــردن گــاو می‌بندند و زمین را با آن شخم می‌زنند.

**گاوانی**: *gâwâni* ڕیشوڵە، سیرۆ، مـزدی شوان. پرنده‌ی سار، مزد گاوچران.

**گاوگۆتـەر**: *gâwgōtar* چـڕنەو پڕنــە، ئاماژە بۆ رووت و ڕەجاڵان. فقیر، بیچاره.

**گاوگـــــــــەردوون**: *gâwgardun* قوربانیکردنی ئاژەڵ لەبەرپێی کەسێ. به یمن قدم قربانی کردن.

**گاولکێ**: *gâweĺkē* ڕێگەرۆینی منداڵی پا نەگرتوو. حرکت کودك با دست و پا.

**گاوەخان**: *gâwaxân* زووینی تـەختکراو بـۆ کـێلان. شـیار مـرزی زمـین شـخم زده، زمین آماده برای کشت.

**گاوەخت**: *gâwaxt* کـاتێ وا، جارجارێـك، دەرفەتێ.گاهی وقت، گاهی اوقات، بعضی اوقات، اوقاتی.

**گاوەرۆ**: *gâwarō* نێو رۆخانەیەکە. نام منطقه و رودخانه‌ای در کردستان.

**گاوەسن**: *gâwasen* گاسن. گاو آهن.

**گاوەســــــەر**: *gâwasar* کۆپــــــاری سەربەبزمار، تەمیە. گاو سر، کتك، چماق، تنبیه.

**گاهەس**: *gâhas* جارجارێك، کاتی وا. گاه باشد، شاید.

**گای مارۆ**: *gâymârō* گایەك کە لەسەر تەویلێـەوە خاڵـێکی سـپی دیـار بـێ بـە چەشنێك کـە جیاوازییەکـی تایبەتـی لـە گەڵ گا کانی تری پێ ببەخشێ. گاوی که خالی سـفید رنـگ در وسـط پیـشانی داشته باشد.

**گـایی**: *gâi(i)* سـواڵکەری، سـواڵکردن، سواڵەت کـردن. گدایی، کار و پیشه گـدا، کسی که به علت نداشتن درآمد معـاش خود را رایگان از دیگران طلب کند.

**گـڕ**: *geŕ* تـاو، بڵێـسە. شـدت گرمـا، شـعله آتش.

**گڕاڵك**: *geŕâĭek* پـووش وشـکە گیـا بـۆ ئاگرکردنەوە. گیاه و خاشـاك خـشك بـرای آتش برپا کردن.

**گڕاڵە**: *geŕâĭa* بڵێسە، شۆڵە. زبانه آتش، شعله.

**گرام**: *gerâm* قەوان. گرام، گرامافون.

**گرامـــــافۆن**: *gerâmâfōn* قـــــەوان. گرامافون.

**گـران**: *gerân* قـورس، سـەنگین، نرخـی زۆر. سنگین، گران، گران قیمت.

**گرانبـــار**: *gerânbâr* بـارقورس، بـاری قـورس، زۆر بـە موشـکوڵ. سـنگین بـار، گرانبار، کنایه از سنگینی.

**گرانجـان**: *gerânjân* کەسـێ کـە شـت زۆرتـــر لـــە نرخـــی خـــۆی بـــە خـــەڵك دەفرۆشی. گرانفروش.

**گرانـــــایی**: *gerânâi(i)* قورســـــایی. سەنگینی، سنگینی.

**گرانی**: *gerâni* گرانایی، قاتبوون، نرخی زۆر. گرانی.

**گـرت**: *gert* گـرد، وەکـو (ئـەویان گـرت). گرفت، گرفتند، مانند (او را گرفتند).

**گـرتگ**: *gerteg* گرتـوو، گـیراو. گرفتـە شدە، اسیر شده.

**گرتگـە**: *gertega* گرتـووە، گردوویانـە، وەکو (ئەویان گرتگە). گرفتەانـد، دسـتگیر کردەاند، مانند (او را گرفتەاند).

**گـرتم**: *gertem* لـە بەنـدم گـرت، وەکـو (زوو گرت). گرفتم، در بنـد کـردم،ماننـد (سریع او را گرفتم).

**گـــرتن**: *gerten* دیلکـــردن، بەنـــدکردن. گرفتن، اسیرکردن، به دام انداختن.

**گرتنـــــــــە مـــــــــــل**: *gertenamel* وەئەستۆگردن. به گردن گرفتن، به عهـده گرفتن.

**گرتنـە نـاو**: *gertenanâw* گـەمارۆدان، لە ناو گردن، گردنە نێو. در میان گرفتن.

**گرتنـــەوە**: *gertenawa* گرتنـــەوە لـــە حـەوا، خـستنەوەجێی شـکاوە. قاپیـدن در هـــوا، تهیـــه و ترکیـــب کـــردن، بهبـــود شکستگی، فال گرفتن.

**گڕدان**: *geŕdân* ئاور تێبەردان، ئاوردان. شعلەور کردن، آتش زدن.

**گردبوونـــــــــــــەوە**: *gerdbunawa* خڕبوونەوە، کۆبوونەوە. جمع شدن.

**گـردن**: *gerden* گـرتن. گـرفتن، بـە دام انداختن.

**گردن**: *gerden* گرتن، وەکو (گرتنـەوەی هەویر). تهیه کـردن، ماننـد (تهیـه کـردن خمیر).

**گردنە دڵ**: *gerdenadeĭ* گرتنە دڵ. به دل گرفتن.

**گردنـه مـل**: *gerdenamel* گرتنـه مـل، وه ئەستـۆ گـرتن. بـه گـردن گـرفتن، بـه عهده گرفتن.

**گردنەوە**: *gerdenawa* گرتنەوە. قاپیدن در هوا، نگاه گرتنەوه.

**گردنـەوە**: *gerdenawa* هـا، پێکهێنـان، وەکـو (گردنــەوەی هــەرگ، گردنـــەوەی حەسێب، گردنـەوەی تـۆکڵی میـوه و شـتی وا). تهیَه کـردن،ماننـد (تهیـه کـردن گـل، فال گرفتن، پوست کندن میوه).

**گردە**: *gerda* گردەڵە. گرد و تپل.

**گردەبڕ**: *gerdabeŕ* مشاری ورد و ناسك تایبـەت بـه نـازك کـاری. اره مـویی، ارەی باریك، یکی از آلات نازك کاری.

**گـــردە پیـــاگ**: *gerdapeyâg* پیـــاوی گردەڵە. مرد کوتاه قد و چاق.

**گـردە ژن**: *gerdažen* ژنـی گردەڵـه. زن کوتاه قد و چاق.

**گردەڵـــە**: *gerdaĺa* گردۆلکـــه. گـــردی کوچك، کروی کوچك، خپله.

**گردەوبـــوون**: *gerdawbun* کۆبـــوون. جمع شدن، اجتماع کردن.

**گردەوکـــــــــــردن**: *gerdawkerden* کۆکردن. جمع کـردن، از روی زمـین جمـع کردن.

**گرزە**: *gerza* گردەڵە، خڕی بچووك. گرز مانند، کنایه از آدم قد کوتاه و چاق.

**گـرژ**: *gerž* ئـاڵۆز، تـووڕە، ناوچـاترش. اخمو، افسرده، عصبانی.

**گــرژانن**: *geržânen* گرژانــدن، تــووڕە بـوون. توهم رفتن، عصبی شــدن، اخــم کردن.

**گرژی**: *gerži* چین لـه سەرتوێـڵ و ئـاڵۆز بوون. خشمگینی، دژم بودن.

**گرســـان**: *gersân* پـــێ بـــوونی ئـــاور، خۆگرتنــــەوە، ســـاقبوونەوە. افروختگـــی آتش، چسپیدن، ترمیم.

**گرســـیاگ**: *gersiyâg* گرســاو. ترســیم شده، افروخته شده، زخم رو به بهبودی.

**گرسیان**: *gersiyân* خـۆ گرتنـەوە، خـۆ گرتنەوەی برین. ترمیم شدن.

**گرشـــە**: *gerša* شــەوقدانەوە، بریقـــه. درخشش.

**گرفت**: *gereft* گیر. گیر، مانع، مشکل.

**گرفتـــوگیر**: *gereftugir* گیروگرفـــت. مشکلات، گیر و گرفت.

**گرفە**: *gerfa* جورێ دەنگە، دەنگی گولله دەنگی بـا. از اصوات، صدای شعله آتــش، صدای گلوله.

**گرفــەگرف**: *gerfagerf* دەنگـی پـــەیتا پەیتا. صدای متوالی.

**گرکـــــە**: *geŕka* چەشنــــێکی کاڵـــەك، کەچەڵ. نوعی خربزه، کنایـه از کـسی کـه سر کچل دارد.

**گڕگـــڕان**: *geŕgeŕân* کایـــەی ئـــاور، گڕوکڵپـەی زۆر. بـازی بـا آتــش، لهیـب و شعله متعدد آتش.

**گڕگرتن**: *geŕgerten* ئاورگرتن. شعلەور شدن، کنایه از به خشم آمدن.

**گرمانـدن**: *germânden* لـه دەنگـەکان، وەکو دەنگی هەور. غریدن.

**گرمۆڵـــە**: *germōĺa* پەپکەبەســـتوو، لەدەورخۆکۆبوونـەوە. بـه دور خـود گـرد شدن، مچاله شدن.

**گرموهۆڕ**: *germuhōŕ* هەرا و هووریا، گرموقاڵ. داد و بیداد، نعره زدن، عربده کردن.

**گرمەگرم**: *germagerm* دەنگی گرمەی پەیتا پەیتا. از اصوات، مانند صدای پاکوبیدن بر روی چیزی یا صدای رعد و برق.

**گرنج**: *gerenj* ددانە، ناساف، دیانە، ئاژ. آج، آژ، زیر، خاردار، دندانە دار، ناهموار.

**گرنج گرنج**: *gerenjgerenj* ددانە ددانە، ئاژدار. دندانە دندانە، آج دار.

**گرو**: *gero* دەستە، تاقم. گروه، دستە.

**گرۆ**: *gerō* مأنوس. انس.

**گڕۆژێ**: *geŕōžē* هەموو رۆژێ. هر روزه، یومیه.

**گرووبان**: *gerubân* پلەیەکە لەناو ئەرتەش و سوپادا. گروهبان، درجەای در ارتش.

**گڕوگاڵ**: *geŕugâĭ* قسەی منداڵی ساواکە تازە زمانی گرتووە. صحبت کردن بچە برای اولین بار.

**گڕەگڕ**: *geŕageŕ* گڕگڕ، کلّپەی ئاور. شعله مدام آتش.

**گرەو**: *geraw* بارمتە، شەرت، وەکو، (شەشی هالە گرەو پەنجیا). گرو، رهن، شرط، مانند (او شش در گرو پنج دارد).

**گرەوبردن**: *gerawberden* گرۆ بردن، شەرت بردن. گرو بردن، شرط بردن.

**گرەوگرتن**: *gerawgerten* بارمتەگرتن. گرو گرفتن، شرط بندی کردن.

**گرەوگان**: *gerawgân* بارمتە، گرەوی. گروگان.

**گرێ**: *gerē* بەند، گرە، وەکو (گرێك بەدەس ئەکرگێتەوە بە دیان نایکەنەوە). گره، مانند (گره‌ای که با دست باز می‌شود با دندان باز نمی‌کنند).

**گریا**: *geryâ* گرا، فرمیسك لە چاوی هات. گریست، او گریست.

**گڕیا**: *geŕyâ* گڕا. شعلەور شد، آتش گرفت.

**گریان**: *geryân* گرین، فرمێسك ڕژاندن. گریستن، اشك ریختن.

**گڕیان**: *geŕyân* گڕیان، ئاور تێبەربوون. آتش گرفتند، آتش سوزی.

**گرێچن**: *gerēčen* تەنران بە گرێ. بافتەی گرەدار.

**گرێدار**: *gerēdâr* هەرشتێ گرێ هەبێ. گره دار، مانند چوب گردو کە دارای گره‌های متعدد است.

**گرێدان**: *gerēdân* گرێ لێدان. گرەزدن.

**گرێدریاگ**: *gerēderyâg* گرێدراو. گره زده شده.

**گرێزە**: *gerēza* نێوی گوند و پردێکە لە دەوروبەری سنە. نام روستایی در حومۀ سنندج و پلی معروف در همین محل.

**گریس**: *geris* ڕۆنی تایبەتی ماشین. گریس، روغن بە دست آمده از محصولات نفتی که مصرف صنعتی دارد.

**گرێ کوێرە**: *gerēkwēra* گرێ کۆرە، گرێکۆرە. گره کور.

**گرین**: *gerin* گریان، فرمیسك، ڕژاندن.

گریستن، اشك ریختن.

**گرێە کوێرە:** *gerēakwēra* گرێ کۆرە. گره کور.

**گـز:** *gez* فـێڵ، درۆ، حۆقـە، وەکـو (گـز لیـدان). تقلـب، حقـه، دروغ، نـارو،ماننـد (تقلب کردن).

**گـزره:** *gezra* گـزر، گیـای کـوتراو بـۆ خۆراکی ئاژەڵ. گیاهی خودرو کـه مـورد مصرف حیوانات علفخوار اسـت، کوبیده شده آن برای تغذیه طیور بـه کار بـرده می‌شود.

**گـزگ:** *gezeg* جـارِوو، گـزی، کـسك. جاروی دستی مخصوص روبیدن اشـغال که از گیاهی به همین نام است.

**گزگجاڕ:** *gezegjâŕ* جارِه گـزگ. منطقه رویش گیاه گز.

**گزگـــدان:** *gezegdân* جاروکێـــشان، جارِوودان، کسکدان. جارو زدن، روبیدن.

**گزگـدریاگ:** *gezegderyâg* گزگـدراو، جارِوودراو. جارو شده، جارو زده شده.

**گزگدەر:** *gezegdar* جارِوودەر، کەسێ کـه جارِوو دەکێـشی. جـارو زن، کـسی کـه جارو می‌زند، جاروکش.

**گزگــز:** *gezgez* یــەکێ لــە دەنگــەکان، دەنگی مـێش. از اصـوات، ماننـد صـدای حشرات.

**گزەر:** *gezar* گەزەر، گزر. زردک، یـک نوع گیاه که ریشه‌ی آن مصرف خوراکی دارد و شبیه هویج اسـت امـا بزرگتـر و رنگ آن زرد است.

**گزەگـز:** *gezagez* لـە دەنگەکان، وەکو دەنگی مـێش. از اصـوات، ماننـد صـدای حشرات.

**گزیـر:** *gezir* بەردەسـت، پێـشخزمەتی خان. پاکار، پیشکار، داروغه، عسس، کنایه از جاسوس.

**گزیـــری:** *geziri* پاکــاری، بەردەســـتی. منـسوب بـه گزیـر، کنایـه از جاسوسـی کردن.

**گزیریکــردن:** *gezirikerden* پاکــاری، بەردەســتی کــردن، ســێخوری. جاسوســی کردن، مأمور به اجرای امر مافوق.

**گژ:** *gež* گـژربوون، وەکو ڕاستبوونــەوی مـوو، روبەڕووبوونــەوه. سـیخ شـدن مـو، گلاویز شدن، مقابله‌کردن.

**گژانـــدن:** *gežânden* راســـتبوونەوەی موو، ئـاڵۆزرکردن. عصبانی کردن، ژولیده کردن.

**گـژانن:** *gežânen* گژانـدن. ژولیـــدن، عصبانی کردن.

**گژگژە:** *gežgeža* گف گف، له دەنگـەکان وەکـو دەنگـی کـژەی بـا. صـــدای بـــاد از اصوات.

**گژنەســـەرە:** *gežnasara* ســـەرقژنی ژوولـراو. ژولیـده مـو، مـو فرفـری، آشـفته مو، موی آشفته.

**گژنیژ:** *gežniž* گشنیژ، گژنێژه. گـشنیز، گیـاهی یکـساله کـه دارای گلـهای سـفید و چتری است، یکی از سبزیهای خوراکی.

**گـــژوگیا:** *gežugiyâ* رووەك. نباتـــات علفی، رستنی‌های گیاهی.

**گژه:** *geža* دەنگی تەووژمی با. صدای وزش باد.

**گژەبا:** *gežabâ* بای توند. باد تند، گردباد.

**گژەگژ:** *gežagež* دەنگی توندی با. صدای باد تند.

**گژیاگ:** *gežyâg* گژراو، وەکو (ئەو قژگەله گژیاگن). ژولیده شده، مانند (آن موها ژولیده‌اند).

**گژیان:** *gežyân* ژوولیان، قرژ بوون. آشفتن، ژولیدن.

**گشت:** *gešt* تێکڕا، هەموو، سەرجەم، وەکو (گشت گوڵەکان). همه، جمع، مانند (همه گلها).

**گشتی:** *gešti* تێکڕای، هەمووی، هەمووانی، به سەرجەم. همگانی، عمومی.

**گشتیان:** *geštyân* تێکڕایان، هەموویان، سەرجەمیان، وەکو (ئەوانە گشتیان). همه آنها، مجموع، مانند (همه آنها).

**گغنی:** *geγni* پەشیمانبوون لە ڕێگای فێڵکردن. دبه درآوردن.

**گفتولفت:** *geftuleft* شێوەیەکی نارەسەن لە وتن. شیوەی نارسا صحبت کردن.

**گڵ:** *geľ* تێکەڵاوی ئاو و خاك. گل، مخلوط آب و خاک.

**گل:** *gel* ژانی چاو، وەکو (چاوم گل ئەکا). تورم و درد ناشی از بیماری چشم، این واژه در میان روستاییان حومه شرق سنندج معنای دفعه و بار هم می‌دهد، مانند (چشم من درد می‌کند).

**گڵ ئاهەك:** *geľ âhak* تێکەڵاوی ئاو وئاهەك. گل آهک، مخلوطی از آب و آهک که مصرف ساختمانی دارد.

**گلاراو:** *gelârâw* ڕەشایی داهاتنی چاو، نەخۆشیی ئەسپەك، بێقەراری. آب مروارید چشم، کنایه از بی قرار و ناآرامی.

**گلاو:** *gelâw* پیوەبوون، تووشبوون. دچار شدن.

**گڵاو:** *geľâw* قوڕوئاو، قوڕ ئاوی. گل و لای، گل آلود.

**گلکردن:** *gelkerden* ژانکردن. به درد آمدن.

**گڵگیر:** *geľgir* گلگیر، قایش قوڕ. پوشش روی چرخ اتومبیل و امثال آن.

**گلوخول:** *geluxol* بزووتن و سووڕانەوە.آمدن و رفتن، بی‌تابی، بی‌قراری.

**گڵەجان:** *geľajân* گڵەنجان، کانی خاکه سووره. معدن خاک رُس،خاک مخصوص سفال سازی.

**گڵەسەر:** *geľasar* کانزایەکە بەم ناوە که سەریان لەحمامدا بەوە دەشوست. گل سرشویه.

**گلەمەن:** *gelaman* گلەمەند، گازنکار. گله‌مند، شاکی.

**گلەودان:** *gelawdân* قبوولکردن، ڕاگردن لەلای خۆ. پیش خود نگهداشتن، قبول کردن چیزی، پذیرفتن چیزی، گرو کشی هم معنا می‌دهد.

**گلەیی:** *gelai(i)* گلەگی، گازن، گازندە. گلگی، گلایه، شکوه.

**گلیاگ**: *gelyâg* تووشبوون، گلاو.
دچار شده.
**گلێر**: *gelēr* خلۆر، گلار. غلت، تلو.
**گلـــــــــێربوونەوە**: *gelērbunawa*
گلاربوونــەوە، خلـۆر بوونــەوە. غلتانــدن،
غلتیده شده.
**گلـــــێرکردنەوە**: *gelērkerdenawa*
گلارکردنــەوە، خلۆرکردنــەوە. غلتانیــدن،
در غلتاندن.
**گلێرەوبـــــــــــوون**: *gelērawbun*
گلارەوبوون. غلتیدن، در غلتیدن.
**گڵێم**: *geĭēm* بەڕی ساکار، ڕاخەرێکی
دەست کرد. گلیم، نـوعی فـرش کـه از نـخ
بافته شده و پرز ندارد.
**گلێنە**: *gelēna* ڕەشکێنەی چاو، ڕەشایی
چاو. مردمك چشم.
**گڵـێنە**: *geĭēna* دەفـری دروسـتکراو لـە
سـواڵەت، گلـێنە، قورینــە. ظــرف نــسبتاً
بزرگ سفالی.
**گمە**: *gema* دەنگی کۆتر. صدای کبوتر.
**گمـــەگم**: *gemagem* دەنگـــی پـــەیتا
پەیتای کۆتر. صدای پیاپی کبوتر.
**گمـــێز**: *gemēz* پیـّــشاو. ادرار، شـــاش،
پیشاب.
**گمـێزدان**: *gemēzdân* جـێ گمـێز لـە
نـاوزك. مثانه، محل جمــع شــدن ادرار و
یکی از اعضاء مهم دستگاه دفع ادرار در
بدن.
**گمێزن**: *gemēzen* مـێزن، ئـەو کەسـەی
کـە تووشـی نەخۆشـیی میزکـردن هـاتووە.
کسی که ادرار زیاد و مکرر دارد.

**گمـــــــێزەچورتکێ**: *gemēzačortkē*
مـێزەچورتکێ. قطره قطـره آمــدن ادرار
ناشی از یک نوع اختلال در دستگاه دفع
ادرار.
**گوان**: *gwân* گۆی مەمکی حەیوان. نـوك
پستان حیوان و محل خروج شیر.
**گوانکردن**: *gwânkerden* مـەمککردن.
بزرگ شـدن بـیخ پـستان، پـستان گــرفتن
در حیوانات.
**گوایا**: *gwâyâ* چما، ئەدی، وازانین. گویا،
پنداری، شاید اینکه.
**گوپ**: *gop* لۆپ، گۆنا، گوب. لپ، گونه.
**گـــوپن**: *gopen* گـــوپ زۆپ. آدم لـــپ
برجسته، چاق، تپل.
**گوپنــە**: *gopna* گـوپن. لـپ چـاق، لـپ
برجسته، تپل.
**گـۆت**: *gōt* کووڕبـوونی دەسـت بـە هـۆی
ســەرماوە. بــیحــس، کــرختی ناشــی از
سرماخوردگی.
**گـۆترە**: *gōtra* گۆترمـە، بـڕە، گـوترو.
حدس، گمــان، تخمــین بــدون حــساب
چیزی ناشمردن و وزن ناکرده، مأخوذ از
ترکی است.
**گۆتەگۆت**: *gōtagōt* به گۆتی کارکردن.
درحالت بی حسی و با اجبارچیزی را لمس
کردن.
**گۆچ**: *gōč* به قسه دەرهێنانی منداڵ یـان
فێـرکردن و به قسەهێنانی. یاد دادن بـچه
نوزاد و به حرف در آوردن او.
**گۆچـان**: *gōčân* عەسـا، داره دسـتی بـه
ساڵا چـووان و.... عــصا، چوبدســتی کــه
پیران و ناتوانان بر آن تکیه کنند.

**گۆچـــان قـــەن**: *gōčânqan* چەشـــنی شیرینی.
نوعی شیرینی سنتی رنگـــی کـــە شـــبیە عصا بود.

**گۆچـــکردن**: *gōčkerden* ئـــەوەڵ شـــیر دانن بە منـــداڵ. شـــیر دادن بـــە بـــچە نـــوزاد برای اولین بار.

**گۆڕ**: *gōŕ* قەبر، زیارەت. گور، قبر، مزار.

**گۆڕ**: *gōŕ* گۆڕ. گور خر.

**گوڕ**: *gōŕ* گەشاو. شاد، شاد، سرحال.

**گۆڕان**: *gōŕân* گۆڕدران. عوض کـــردن، متغیر، مبادلە کردن.

**گـــۆران**: *gōrân* یەکێکـــە لـــە زاراوە ســـەرەکییەکانی زمـــانی کـــوردی کـــە باجەلأنی، کاکەیی، سنجاوی، کەنوولەیی و هـەورامی دەگرێتـەوە. یکـــی از لهجـــات اصلی زبان کـــردی کـــە چنـــد منطقـــە از مناطق کردستان ایران و عراق را شـــامل می شود. خێڵێکی گەورەی کوردە کـە لـە هـەورامان دەژیـن. نام طایفە ای از مـــردم کرد کە در اورامـــان کردســـتان اســـکان دارند.

**گـۆڕانن**: *gōŕânen* گـۆڕدران. عـــــوض کردن، تبدیل کردن.

**گۆڕاننـــەوە**: *gōŕânenawa* گۆڕانـــەوە. معاوضە کردن، تبدیل کردن.

**گـۆرانی**: *gōrâni* بەسـتە. ترانـە، آواز، سرود.

**گۆرانیخوێن**: *gōrânixwēn* گۆرانیوێژ. آوازە خوان، خوانندە آواز.

**گـۆرانی وتـــن**: *gōrâniweten* گـۆرانی خوەندن. آواز خواندن، ترانە خواندن.

**گۆرانیوێـــژ**: *gōrâniwēž* گۆرانیبـــێژ. خوانندە، ترانە خوان، آوازە خوان.

**گۆڕای گۆڕ**: *gōŕâygōŕ* پەیتا پەیتا. پشت سر هم، متوالی.

**گۆڕبـــەگۆڕ**: *gōŕbagōŕ* گـــۆر گـــۆرین جنیۆیکە. گور بە گور، مردەای کە از گـور بـە در آوردە و در جـای دیگـر دفـن کننـد نفرینی است دربارە مردە.

**گـورج**: *gorj* ئامـادە، لەبـەرکردنی جلـی داکەنراو. لباس پوشیدە، چابك، چالاك.

**گـورج**: *gorj* زوو، پەلـە. سـریع و فـوری، آنی.

**گورجـــا و گـــورج**: *gorjâwgorj* زۆر بەپەلە. خیلی سریع و فوری.

**گورجبوونـــــــــــەوە**: *gorjbunawa* لەبەرکردنەوەی جلی داکەنراو. پوشیدن لباس بعد از کندن آن و آمادەشدن.

**گورجکردنـــــەوە**: *gorjkerdenawa* لەبەرکردنـەوەی جلـی داکـەنراو لـە خـۆ. آمادە کردن، لباس پوشانیدن.

**گورجوگـۆڵ**: *gorjugōľ* چـالاك، بـەکار، ئازا. آمادە، سرحال، چابك و چالاك.

**گورجـــــــــــەوبووگ**: *gorjawbug* گورجەوبوو، پۆشراو. پوشیدە و آمادە.

**گورجـــــەوکریاگ**: *gorjawkeryâg* گورجـــەوکراو. لبـــاس پوشـــانیدە شـــدە، آمادەشدە.

**گـورجی**: *gorji* بـێ درەنگـی، ئامـادەگی، چـالاکی، ئـازایی، نێویـك بـۆ ژنـان. فـوری، نامی زنانە، منسوب بە گرجستان از مردم گرجستان.

**لـەزەدار**: *lazadâr* خـۆش تـام، بـەتام، مـەزەدار. بامزه، خوش طعم، لذیذ، خوش مزه.

**لەزیز**: *laziz* بەتام. لذیذ، بامزه، خـوش طعم.

**لـەزیزە**: *laziza* بـەتام، خۆشەویـست، نێوێکە بۆ ئافرەتـان. خوراک خوش طعم، بامزه، خوش مزه، لذیذ، نامی زنانه.

**لەسەر**: *lasar* له ئەستۆ. بر عهده.

**لەســـەر رۆیـــن**: *lasarŕoin* لەســـەر رۆیــشتن، دەســتبەرنەدان، ســوور بــوون. دنبال کردن، اصرار کردن.

**لەسەرکردن**: *lasarkrden* لایەن گرتن. حمایت کردن، پشتیبانی کردن.

**لـە سـەرەو**: *lasaraw* سـەرلەنوێ، وەکـو (لەسەرەوە نووسیمەوە). از نـو، از اول، از آغـاز، دوبـاره، ماننـد(دوبـاره از نـو آنـرا نوشتم).

**لەســـەریەك**: *lasaryak*بــێ پــسپانەوە، پەیتا پەیتا، پشتیوانی یـەك بـوون. بـدون وقفه، پیاپی، پشتیبان هم بودن.

**لەش**: *laš* جەستە، ئەنـدام. جسد، انـدام، کالبد.

**لەش**: *laš* کنایه له مرۆڤی تەمبەڵ. لش، کنایه از آدم تنبل، تن لش، کاهل.

**لـەش چـەپەڵ**: *laščapaĭ* لـەش پـیس، کەسێك کـە غوسـڵی لەسـەرە. جنابـت دار، بدون غسل.

**لـەش ســاق**: *laššâq* لـەش سـاغ. سـالم، تندرست.

**لـەش ســۆك**: *laššōk* لـەکار ئـازا، دژی تەمبەڵی. چابك، چالاك، فرز در کار.

**له شۆر دەرچوون**: *lašōrdarčun* لەتام دەرکـردن. از انـــدازه در رفـــتن، از حـــد گذشتن.

**لەعین**: *la eyn* نەحلەتکراو. لعین، لعنت شده، نفرین شده.

**لـــەغاو**: *laγâw* سووچـــی لـــێو، لغـــاو، هەوسار. لگام، افسار، گوشه لب اسب.

**لــــــــــــەغاوکردن**: *laγâwkerden* هەوسارکردن. لگام زدن، افسار زدن.

**لەغاوە**: *laγâwa* هەوسار، سووچی دەم. گوشه لب، لگام، افسار.

**لەق**: *laq* چڵی دار. شاخه.

**لـەق**: *laq* سـست، جـێ نـەگرتوو. هـرز، سست، نااستوار، جلف.

**لەقانن**: *laqânen* لەراندن. تکان دادن.

**لـەق لـەق**: *laqlaq* لەقلـەق، بالدارێـکی گەورە و سـپی ڕەنگـە. لـك لـك، پرنـدەای که دارای پاها و بالهای بلند و گردنـی دراز اسـت، ایـن پرنـده بـر روی درختـان لانـه دارد.

**لـەق لـەق**: *laqlaq* چێشتیکە. یکـی از انواع غذاهای سنتی که ازترکیب کنجـد سیاه، گندم، روغن و نمـک اسـت و بـه صورت حلوا پخته می شود.

**لـــــەقوپۆپ**: *laqupōp* لکووپـــــۆپ. شاخەهای درخت، شاخ و برگ.

**لەقولۆق**: *laqulōq* شل و سست، مروڤـی هەرزە. از هم در رفته، نا محکم، کنایـه از آدم هرزه و بد عمل.

**لەقە**: *laqa* راوەشاندنی پێ. لگد، ضربه با پا.

**له قه‌شێل**: *laqašēl* شیلاندن به پێ. لگدکوب، پایمال.

**له‌قه فرتێ**: *laqafertē* لاقه فڕی، لنگه فرتێ. دست و پا زدن در حالت نزع یا شرایط دیگر.

**له قه‌ماڵ**: *laqamâĭ* له‌قه‌شێل. لگدکوب، لگدمال.

**له‌قین**: *laqin* سستی، له‌قان، له‌ڕکی. لنگی، لنگیدن.

**له کار خستن**: *lakârxesten* له‌کار که‌وتن، بێ به‌هره کردن. از کار انداختن.

**له کار که‌فتگ**: *lakârkafteg* له‌کار که‌وتوو. از کار افتاده.

**له کۆڵ که‌فتن**: *lakōĭkaften* له کۆڵ که‌وتن، له ئه‌ستۆکه‌وتن. از گرده افتادن، از عهده خارج شدن.

**له کوێنا**: *lakwēnâ* له‌کوێدا، له‌کوێی. در کجا، در کدام جای و مکان.

**له که‌ره‌م که‌فتگ**: *lakaramkafteg* له که‌ره‌م بوو. از کار افتاده، خراب شده، اسقاط شده، می‌تواند کنایی هم باشد.

**له کیس چووگ**: *lakisčug* له کیس چوو، له ده‌سچوو. از دست رفته، ضایع شده، تباه شده، به هدر رفته.

**له‌گره**: *lagra* له ئه‌م جیه، له ئه‌م جێگایه، وه‌کو (ئه‌و چه‌ن رۆژێ له‌گره ماوه). در اینجا، مانند (او چند روزی در اینجا به سر برد یا مانده بود).

**له گره‌و دوا**: *lagrawdwâ* له ئێره‌و دوا، ئیسته به دوا. از این به بعد، از حالا به بعد.

**له گره‌ولا**: *lagrawlâ* له‌ئێره‌وه‌لا. از این به بعد، از حالا به بعد.

**له‌گره‌وه**: *lagarawa* له ئیسته‌وه، له ئێره‌وه. از اینجا به بعد.

**له گۆچووگ**: *lagōčug* له‌گۆچوو، شه‌رمه‌زار کراو. بی حس شدن اندام و زبان، از رو رفته، شرمنده شده.

**له گۆچوون**: *lagōčun* شه‌رمه‌زار بوون. کنایه از رو رفتن، شرمنده شدن.

**له‌لا**: *lalâ* له‌کن، له‌که‌نار. در نزد، در پهلو، در کنار، نزد، همجوار.

**له‌لام**: *lalâm* له که‌ناری من، له‌کن من. در کنارم، نزد من.

**له له**: *lala* نۆکه‌ری گه‌وره ماڵان که په‌روه‌رده کردنی منداڵانی کوڕی له ئه‌ستوو بوو. نوکر پا به سن گذاشته که مسئول پرورش فرزندان پسر اعیان و اشراف بود.

**له‌له‌کردن**: *lalakerden* شوێن شوێن کردن و هه‌ڵکه‌ندنی داری ده‌ست. چوب خط کردن، چوب خط زدن.

**له‌م**: *lam* له‌ئه‌م، وه‌کو (له‌م به‌ێنا). در این میان، در این مدت، مانند (در این مدت).

**له‌مانه**: *lamâna* له‌ئه‌مانه، وه‌کو (ئا له‌مانه). از اینها، مانند (از اینها).

**له مل**: *lamel* له گه‌ردن، له ئه‌ستۆ. بر گردن، برعهده.

**له‌ملا**: *lamla* له ملا، وه‌کو (له‌ملا بگه‌ڕه بۆی). از این طرف، مانند (از این طرف دنبالش بگرد).

**لەمە**: *lama* لەم شتە، لە ئەم شتە، وەکو (لەمە مە بە پێ). از این، مانند (از این به من بده).

**لەمە بەولا**: *lamabawlâ* لێرەبەولا، لەمەبەدوا. از این به بعد.

**لەمەوبەر**: *lamawbar* لەمەو پێش. پیش از این.

**لەمەودوا**: *lamawdwâ* لەمەو پاش. از این به بعد، از حالا به بعد.

**لەمەولا**: *lamawlâ* لەمەوپاش. از این به بعد، زمان آینده.

**لەمەولاوە**: *lamawlâwa* لەمەولا. از این به بعد، از حالا به بعد.

**لەم یاکە**: *lamyâka* لەمی تریان، وەکو (لەم یاکەم بەپێ). از این یکی، مانند (از این یکی به من بده).

**لەمیش**: *lamiš* لەمیچ، وەکو (لەمیش بە). از این هم، مانند (از این هم بده).

**لەناو**: *lanâw* لە نێو، وەکو (لەناوچوو). در میان، مانند (از میان رفت).

**لەناو بریاگ**: *lanâwberyâg* فەوتاو، لەناو براو. از بین برده شده.

**لە ناوچووگ**: *lanâwčug* نەمان. نابود شده، فنا شده.

**لەنج**: *lanj* رك، رق، ڤین. لج، کین.

**لەنجباز**: *lanjbâz* رق لە دڵی، لاسار، ڤیناوی. لجوج، لجباز.

**لەنجە**: *lanja* بە ناز ڕۆیشتن، ڕێگا چوون بە ناز. خرام، باعشوه و ناز راه رفتن.

**لەنگ**: *lang* لەق، پای سەقەت، لاسەنگ. لنگ، نامیزان، ناقص.

**لەنگەر**: *langar* کەرەسەیەکە بۆ راوێستاندنی کەشتی، جێ خۆشکردن و حەسانەوە. لنگر، جاخوش کردن، ابزاری برای از حرکت باز داشتن کشتی یا قایق.

**لەنگەر خستن**: *langarxesten* کەنارگرتنی کەشتی، ئاماژەیە بۆ جێ خۆشکردنی مێوان ومانەوەی. لنگر انداختن، کنایه از کسی که درجایی جا خوش کرده باشد.

**لەنگی**: *langi* لەقی، پای سەقەت، لاسەنگی، شەلی، کەمی. لنگی، نامیزانی، کاستی

**لەنگین**: *langin* ڕێگەچوون بەشەلی، لە پێداویستییەکانی ژیاندا. لنگیدن، راه رفتن لنگ، کم آوردن نیازمندیهای زندگی.

**لەواش**: *lawâš* نانی تەندووری. لواش، نان لواش.

**لەوان**: *lawân* لە ئەوان، وەکو (لەوان ئەچێ). از آنان، مانند (شبیه آنان است).

**لەوانە**: *lawâna* لە ئەوانە، پاژێکە لەوان، لەوشتانە، وەکو (لەوانە بخوە). از آنها، مانند (از آنها بخور).

**لەور**: *laor* لەون، شێوە. شیوه، طرزکار.

**لەوسا**: *laosâ* لەو جارەکە، لەوکات. از آن دفعه، از آن زمان.

**لەو ساوە**: *laosâwa* لەو جارەکەوە، لەوکاتەوە. از آن دفعه، از آن بار، از آن وقت.

**لەولاو**: *laolâw* ئالەوێیەوە، لەوێیەوە. از آن طرف.

**لەولاو**: *laolâw* نێوی گوڵێکە، لاو لاو. گل نیلوفر.

**لەون:** *laoen* شێوە. طرز، شیوه.

**لەوە:** *lawa* لەوشتە، وەکو (لەوە کەهاتگە بێرانە). از آن قسمت، مانند (از آن قسمتی که تازه آمده بیاور).

**لەوە بەر:** *lawabar* پێش ئێستە، پێش ئەوشتە. قبل از آن، در زمان گذشته.

**لەوە دوا:** *lawadwâ* لەوە پاش، پاش ئەوە. بعد از آن، بعد از این.

**لەوەڕ:** *lawaŕ* خۆراکی ئاژەڵ. چرا، علف مورد استفاده دام.

**لەوەڕاندن:** *lawaŕânden* چەراندنی ئاژەڵ. چرانیدن.

**لەوەڕانن:** *lawaŕânen* لەوەڕاندنی ئاژەڵ. چرانیدن.

**لەوەڕگا:** *lawaŕgâ* جێ لەوەڕ، لەوەڕگە. چراگاه، جای چرای حیوانات.

**لەوەڕگە:** *lawaŕga* جێ لەوەڕی ئاژەڵ، لەوەڕگا. چراگاه.

**لەوەڕین:** *lawaŕin* لەوەڕان. چریدن.

**لەوەن:** *lawan* خنجەکەر. لوند، عشوه گر، طناز.

**لەوەیچە:** *lawiča* لەوەیشە. از آن هم، تأکید.

**لەوەیشە:** *lawiša* لەوەیچە، لەویشە. از آنهم، تأکید.

**لەویچ:** *lawič* لەویش، وەکو (لەویچ بێرا بۆم). از آن هم، مانند (از آن هم برای من بیاور).

**لەویچە:** *lawiča* لەویشە، وەکو (لەویچەبە). از این هم، از آن هم، مانند (از آن هم بده).

**لەویشە:** *lawiša* لەویچە، وەکو (لەویشە بخوە). از آن هم، مانند (از آن هم بخور).

**لەێرا:** *laērâ* لە ئێرا، لێرا، وەکو (ئالەێرا بوو). در اینجا، مانند (در اینجا بود).

**لەێرە:** *laēra* لێرا، وەکو (لەێرە کارمان ئەکرد). اینجا، مانند (در اینجا کار می‌کردیم).

**لەیلاخ:** *laylâx* باژێر و ناوچەیەکە لە رۆژهەڵاتی سنە کە شاری دیگولان ناوەندیەتی. نام منطقه‌ای در شرق سنندج به مرکزیت شهر دهگلان.

**لەیلی:** *layli* یاری مەجنوون و ناویکی ژنانەیە. نام زنانه، معشوق مجنون در داستان (لیلی و مجنون) اثر حکیم نظامی.

**لەێنا:** *laēnâ* لەویا، لەئینا، وەکو (دایکم لەێنا دانیشت). در آن مکان، در آنجا، مانند(مادرم در آنجا نشست).

**لەێنە:** *laēna* لەوێ، وەکو (دایکم لەینە بوو). درآنجا، مانند (مادرم در آنجا بود).

**لەیەك بوون:** *layakbun* جیا بوونەوە. از هم جدا شدن.

**لەیەکبوونەوە:** *layakbunawa* لەیەك جیابوونەوە. از هم جدا شدن.

**لەیەك بەردان:** *layakbardân* جیابوونەوە، بچڕان. از هم جدا شدن، گسستن

**لەیەك ترازان:** *layaktrâzân* لێك ترازیان، لێك بەربوون. از هم گسیختن، از هم جدا شدن.

**لەیەك چوون:** *layakčun* لێکچوون، وەکو یەك بوون. شبیه، مانند، همانند.

**لەیەکـــدان**: *layakdân* لەیـــەکتردان، لێکدان. همـدیگر را زدن، بهـم خـوردن، زد وخورد.

**لەیەکـدریاگ**: *layakderyâg* تـێکدراو، لێك بڵاوبوو، لێکپـچڕان. بـرهم زده شـده، از هم پاشیده شده، از هم گسستن.

**لەیـەك کردنـەوە**: *layakkerdenawa* لـێك جیاکردنـەوە. جـدا کـردن از هـم، از هم گسستن.

**لـێ**: *lē* لـە ئـەو، وەکـو (لـێ مـاگ). از او، مانند (از او به جای مانده).

**لێ**: *lē* لـەوە، وەکـو (لـێ بگـردگ). بـر او، مانند (بر او گذشته).

**لیباس**: *libâs* جلوبەرگ، پۆشەن، ئـەوەی کە لەبەری دەکەن. لباس، جامه، پوشاك.

**لـــێبڕیان**: *lēbeŕyân* لێکـــدابڕان. دل کندن، جدا شدن از هم.

**لـێبووگ**: *lēbug* لـێکراو. از آن محـروم شده.

**لـــێپرسیاگ**: *lēpersyâg* لێپرســـــراو، پرسیارلێکراو. از او سئوال شده.

**لـێپرسین**: *lēpersin* پرسـیار لەکەسـێ کردن. سئوال از کسی کردن.

**لێت**: *lēt* لەتۆ، وەکو (لێت ناترسم). ازتو، مانند (از تو نمی‌ترسم).

**لیتـە**: *lita* جـۆرێ ترشـی، لـێخ. نــوعی ترشی مخلوط و له شده.

**لـێخریاگ**: *lēxeryâg* لـێخراو. متـــصل شده، الحاق شده.

**لێخستن**: *lēxesten* پیاهەڵواسین. متصّل کردن.

**لێخشاندن**: *lēxešânden* پیامـاڵین، بـە ئەسپایی. آهستگی مالاندن.

**لێخـشیاگ**: *lēxešyâg* لێخـشراو. بـە آن مالانده شده.

**لیخن**: *lixen* لێڵ، ئاوی قوڕین، قوڕئاوی. آب کدر و آلوده، آب گل آلود.

**لــێدان**: *lēdân* کوتــان، ئــازاردان. زدن، کوبیدن.

**لـێدزین**: *lēdezin* دزینـەوە. دزدیـدن از کسی یا چیزی.

**لێدەر**: *lēdar* کەسێ کە لێ دەدا. ضارب، ضربه زننده.

**لـێرا**: *lērâ* لـە ئەیـرا، لـەم شوێـنە، وەکـو (لـێرا بـووین). در اینجـا، اینجـا، ماننـد (اینجا بودیم).

**لـیرگ**: *lirg* لـیر، نەخۆشـییەکی پێـستە. کهـیر، جوشـهای ریـز ناشـی از حـساسیت پوستی.

**لیرە**: *lira* سکەی زێـڕ، دراوی زێـڕ. طلای مسکوک.

**لێرە**: *lēra* لەێرە، لەگرە، لەم شوێـنە. در اینجا، اینجا.

**لـێرەوبەدوا**: *lērawbadwâ* لـێرەبەدوا، لەمـەوپاش. از ایـن بـە بعـد، از اینجـا بـە بعد، از حالا به بعد.

**لـــێرەودوا**: *lērawdwâ* لەمـــــەودوا، لەمـەوپاش. از اینجا بـە بعـد، از حـالا بـە بعد.

**لێرەوە**: *lērawa* لەم شوێـنەوە. از اینجا به بعد، از حالا به بعد.

**لێزان**: *lēzân* پسپۆڕ، زۆر زانا لە شتێ. کاردان، ماهر، متخصص.

**لێزانین**: *lēzânin* لەشتێ زۆر زانین. ازآن آگاه بودن.

**لـێزمە**: *lēzema* رێـژنە، رەهـێڵە. رگبـار تند باران که موجب سیل می گردد.

**لێژ**: *lēž* سەربەرەوخوار، سەربەرەو ژێـر. سرازیر، شیب تند.

**لـێژایی**: *lēžâi(i)* زۆر لـێژ، جێگایـەکی لێژ. سرازیری، شیبدار.

**لێژی**: *lēž* لێژایی. سرازیری، شیب تند.

**لێس**: *lēs* زمان بە شتێدا هێنان. لیس، با زبان چیزی را پاک کردن.

**لێستن**: *lēsten* زمان ساوین لـە شتـێك و خواردنی. لیسیدن، با زبان چـیزی را پـاك کردن.

**لێـستنەوە**: *lestenawa* لێـستن. نگـاه لێستن.

**لێسیاگ**: *lēsyâg* لێساو، لیستراو. لیـسیده شده.

**لێـشاو**: *lēšâw* ئـاوی زۆر و بـە تـەوژم. جریان زیاد آب، سیلاب.

**لێف**: *lēf* پێخەفێ ناوتێخراو، لـێفە. لحاف، نوعی روکش خـواب کـه بـا دسـت دوختـه می‌شود.

**لیـف**: *lif* کیـسەی سـابوون لــە حــەمام، کیـسەی سابوون بـۆ خـۆ شـتن. کیـسەی صابون که در حمام به بدن می‌مالند.

**لێفدوور**: *lēfdur* لـێفە دوور، کەسـێ کـە لێف دەدووروێ. لحاف دوز، کسی کـه پیـشه او تولید لحاف است.

**لیفە**: *lifa* کیسەی سابوونی حەمام. لیف، کیسه صابون حمام.

**لیق**: *liq* لیچق، نەرموخر. لزج.

**لیقن**: *liqen* لچقن. لزج.

**لـێقۆمیاگ**: *lēqōmyâg* لـێقۆماو. نگـاه لێ قۆمیان.

**لێقـۆمین**: *lēqōmin* تووشـی بەڵایـەك هاتن. دچار بلایی شدن.

**لیـك**: *lik* ئـاوی دەم. بـزاق دهـن، آب لـزج دهان.

**لـیکن**: *liken* کەسـێك کـە ئـاوی دەمـی هاتبێتــە خـوارێ. کـسی کـه آب دهـانش سرازیر شده باشد.

**لێگرا**: *lēgrâ* لێرا، لەم شوێنە. در اینجا، اینجا.

**لێگـرتن**: *lēgerten* لـە کەسـی یـا شـتێ (گـرتن)، رەخنـەگرتن. از کـسی یـا چـیزی برگرفتن، ایراد گرفتن.

**لــــێگرتنەوە**: *lēgertenawa* کــــەم گرتنـەوە. چیزی از شخصی گرفتن، ایراد گرفتن، کم کردن، کاستن.

**لـێگروە**: *lēgrawa* لــەم شوێــنەوە. از اینجا به بعد.

**لێگرە**: *lēgra* لێرا. اینجا، همین جا.

**لێڵ**: *lēĭ* تەماوی، لیخن، گڵاو. تار و کدر.

**لـێڵاو**: *lēĭâw* ئـاوی لـیخن. آب کـدر، آب گل‌آلود.

**لـێڵاوی**: *lēĭâwi* قوڕئـاوی، لـیخنی. گـل آلودگی، کم سویی چشم.

**لێڵایـــی**: *lēĭâi(i)* کوێـــرایی، وەکـــو (چاوەکانم لە دووریت لێڵاییان داهـات). تار شدن چشم، مانند (دیدگانم از دوریـت تار شده‌اند).

**لــــێڵایی داهــــاتن**: *lēĭâi(i)dâhâten* کوێرای داهاتن. تار شدن چشم.

**لـێلكردن**: *lēĭkerden* لیخنکـردن. گـل آلود کردن، کدر کردن.

**لـێڵی**: *lēĭi* تـەماوی، ئـاوی لـیخن. تـاری، کدری.

**لـێم**: *lēm* لـەمن، وەکـو (لـێم تۆریاگـە). برمن، از من، مانند (اه با من قهر کرده).

**لـێمان**: *lēmân* لـە ئـێمە، وەکـو (لـێمان رەنجیاگـە). برمـا، از مـا،ماننـد (از مـا رنجیده است).

**لیمـۆ**: *limō* هـا، مـێوەیەکە. لیمـو، از مرکبات که دو نوع شیرین و ترش دارد.

**لیمۆیی**: *limōi(i)* بەڕەنگی زەردی لیمۆ. رنگ لیمویی، یکی از انواع رنگها.

**لـێنا**: *lēnâ* لـەوێ، وەکـو (دوێـکە لـێنا بووین). آنجا، مانند (دیروز آنجا بودیم).

**لیـنج**: *linj* تـامی لـچق، وەکـو (سرینـچك تامی لینجـە). طعم گس، ماننـد (سـنجد طعم گسی دارد).

**لینجی**: *linji* تامی لچقی. طعم گسی.

**لـینی**: *lini* دەسـەڵێنکراو. اهلـی، دسـت آموز، اهلی شده، رام شده.

**لێنیان**: *lēniyân* لێنان. بارکردن.

**لێو**: *lēw* لچ، لب.

**لیوان**: *liwân* پەرداخ، دەفری تایبەت بـە ئـاوخواردن. لیـوان، ظـرف مخـصوص آشامیدن آب.

**لـێوانلێو**: *lēwânlēw* لێوالـێو، پڕاوپـڕ. مالامال، لبریز، پُر، انباشته.

**لێوە**: *lēwa* روو لە شێتبوون، زۆروێژ. نیمه دیوانه، هرزەگو، هرزەگرد، لوده.

**لێویاگ**: *lēwyâg* لێواو، شێت بوو. نیمه دیوانه شده.

**لێویان**: *lēwyân* شێتبوون. روانی شدن.

**لێهاتگ**: *lēhâteg* لێهاتوو، توانا. کارآمـد، لایق، شایسته.

**لـێهاتن**: *lēhâten* لـە دەسـت هـاتن، لـە توانابوون. از او برآمدن.

**لـێ هـەڵگیریاگ**: *lēhaĭgiryâg* لـێ هەڵگیراو، دزینەوە لە شتێ. برگرفته شده، تقلید شده.

# م

یەکێ لە پیتەکان.
از حروف الفبا که میم تلفظ می‌شود.

**مـا:** *mâ* دژی نـێر، مـێ. مادینـه، جـنس مخالف نر، زاینده.

**ما:** *mâ* ژیا، ماندگار. ماند، مانده است.

**مابەین:** *mâbayen* نێوان. میان، میانه، مابین.

**مات:** *mât* کـز، سەرسووڕماو، ڕەنگـی بـێ بریقە. مات، متحیر، کدر.

**ماتاو:** *mâtâw* جورێ کەرەسەی تایبـەت بـۆ یـاریکردن لـە شـەوی نـەورۆز. یکـی از انواع وسایل آتش بازی شب عید نوروز.

**ماتــاوان:** *mâtâwân* نــێوێکی ژنانــه. مەتابان، نامی برای زنان.

**ماتبوون:** *mâtbun* واق بوون، کز بـوون، بێ دەنگ بوون. متحیر ماندن، مات شدن.

**مـاتکردن:** *mâtkerden* بـێ دەنگکـردن، بەزاندن لە کایەی شەترەنج. ماتکردن در شطرنج، متحیر کردن.

**ماتڵ:** *mâteĭ* تەما. منتظـر، معّطـل، در انتظار.

**ماتڵی:** *mâteĭi* تەمادار. انتظارکــشیدن، معطلّی، در انتظاری.

**ماتــه:** *mâta* کزکــراو، مــات بردنـــەوە. گوشە گیری، خیرەگی.

**ماتـــه بـــردن:** *mâtaberden* مـــات بردنەوە. خیره شدن.

**ماتەمات:** *mâtamât* واق نـواڕین. خـیره نگاه کردن، خیرەگی.

**ماتی:** *mâti* بێ ڕەنگی، کزی، بێ دەنگی. رنگ مات، تحیر، خیرەگی.

**مـاچ:** *mâč* ڕامـووس، ڕامووسـان. بوسـه، بوس، با لب چیزی را لمس کردن.

**ماچکردن:** *mâčkerden* رامووسین. بوسیدن، ماچ کردن.

**مـــاچ و مـــوچ:** *mâčumuč* رامووســـین. روبوسی کردن دو نفر با هم.

**ماچێك:** *mâčēk* تـەنیا یـەك مـاچ. یـك ماچ، بوسەای.

**ماد:** *mâd* یەکێ لە قەومە ئارییەکان کە کوردان لـەو قەومـەن، مادەکـان یەکـەمین دەوڵەتی ئێرانیان پێك نـا. قوم مـاد، کـه اولـــین امپراطـــوری ایـــران را بنیـــــان گذاردند، یکی از اقوام آریایی هستند که کُردها از آن نژادند.

**مـار:** *mâr* جانـەوەرێکی خزۆکـی درێـژ و ژاردار. مـار، جـانوری از راسـته خزنـدگان کـه انـواع مختلـف دارد و غالـب آنهـا نـیش زهرآگین دارند.

**مارانگاز:** *mârângâz* مارپێوەداو. مارگزیده.

**مـاراو:** *mârâw* نــێوی گوندێـکە. نـام روستایی بین سنندج و کامیاران.

**مارتووڵە:** *mârtuĭa* بێـچووی مـار. بـچه مار.

**مارچـــێوه**: *mârčēwa* داری تایبـــەت بـــەمارگرتن، نـــێوی گیایەکـــە. چـوب دو شاخه مارگیری، گیاهی وحشی.

**مارگــەزیاگ**: *mârgazyâg* مارگــەزراو، مارگەزته، مارگەستراو. مارگزیده شده.

**مارگەســـــته**: *mârgasta* مارانگـــــاز، مارگەستوو. مارگزیده.

**مــارگیر**: *mârgir* هــا، کەسـێك کـە مــار شکار دەکا. مارگیر کـسی کـه پیـشه او شکار مار است و آنرا در معـرض دیـــد مردم می‌گذارد یـا آن را بـه مؤسـسات تحقیقاتی می‌فروشــد از ایــن راه امــرار معاش می‌کند.

**مارماسی**: *mârmâsi* جۆرێك مار کە لە ئاودا دەژی. مارماهی، نوعی از آبزیـان کـه به شکل مار است.

**مــارمزووك**: *mârmezuk* گیانلەبەرێـکە، مارماروك، مارمێلکە. مارمولک، جـانوری اســت کـــه در صــحرا و بیابــان زنـــدگی می‌کند نوع خانگی آن نیز وجود دارد.

**مارە**: *mâra* نیکاح. عقد، نکاح بین زن و مـرد برای شـروع زندگی مـشترك، عقـد ازدواج.

**مارەبڕ**: *mârabeŕ* کەسـێ کـە دوعـای تایبــــەت دەخوێنـــــی و لــــە دەفتــــەر دەینووسـێ. کسی که صیغه عقد را جاری می کند.

**مــارەبڕان**: *mârabeŕân* ڕەسمویاسـای مارەکردن. عقد کنان.

**مارەبڕانــــە**: *mârabeŕâna* پـــــارەی تایبەت بە ژن کە لە سەر پیاو دای دەنێن. هزینه عقد کنان.

**مارەبڕیــاگ**: *mârabeŕyâg* مــارەبڕاو. عقد شده، نکاح شده.

**مــارەبڕین**: *mârabeŕin* ڕەسمویاسـای ژن حەڵاڵ کردن بۆ پیاو. عقد کنان، عقـد کردن.

**مــارەکردن**: *mârakerden* مـارە بـڕین. عقد کردن.

**مارەکریــاگ**: *mârakeryâg* مــارەکراو. عقد کرده شده، عقد شده.

**مارەکە**: *mâraka* زۆر سەیر، مەعرەکە. معرکه، جای نبرد، بسیار تعجب آور است.

**مارەیی**: *mârai(i)* پارەیەك کە ژنـی لـە سەرمارە دەکـرێ. مهریه، مهــر، پــول یــا چیزی قیمتی که هنگام عقد بر عهــده‌ی مرد می گذارند.

**مـــازگ**: *mâzeg* مـــازوو، بــــەری داری بـەڕوو. مـــازوج، مـــازو، مـــاده ای کـــه از درخت بلوط به دست می‌آید و در صنعت دباغی و طب مورد استفاده است.

**مازگـە**: *mâzega* بڕبـڕەی پـشت. سـتون فقرات.

**مـاس**: *mâs* پەنـەمینی ئەنـدام. آمــاس، ورم عضلانی یا پوستی بر اثر بیماری.

**ماس**: *mâs* ماسـت. ماست، یکـی از اقـلام مهم لبنیات که از شیر درست می‌شود.

**ماسـان**: *mâsân* نـێوی گوندێـکە. نـام روستایی است.

**ماساو**: *mâsâw* ماستاو. آبدوغ، ترکیب دوغ و آب به صورت غلیظ
**ماسرێشم**: *mâserēšem* سیرێشی که له ماسی دەگیردرێت. سریشم، ماده ای چسبناک که مصرف صنعتی دارد.
**ماسماڵی**: *mâsmâii* پۆشاندنی کردەویەکی خراپ. ماستمالی، کنایه از سر هم بندی کردن کاری به طور موقت.
**ماسه**: *mâsa* رمڵ، مڵ. ماسه، شن کف رودخانه.
**ماسی**: *mâsi* ماسی گیانلەبەرێکی ئاوی. ماهی، یکی از انواع پُر کثرت آبزیان.
**ماسیاگ**: *mâsyâg* پەنەماو. ورم کرده.
**ماسیان**: *mâsyân* ماسان، پەنامان. آماسیدگی، ورم کردن.
**ماسی فرۆش**: *mâsiferōš* کەسێ کە پیشەی فروتنی ماسییە. ماهی فروش، کسی که پیشه او فروش ماهی است.
**ماسیگیر**: *mâsigir* کەسێ کە پیشەی ڕاوەماسییە. ماهیگیر.
**ماسیله**: *mâsila* مارمیلکەی نێو خانوو که له جێی شیداردا دەژی. حشرەای که در جایی نمدار زندگی می‌کند.
**ماسین**: *mâsin* پەنەمین. آماسیدن، ورم کردن.
**ماش**: *mâš* دانەوێڵەیەکە. ماش، از دانه‌های خوراکی شبیهه گندم و عدس.
**ماشانن**: *mâšânen* قووتدان و هەڵمژین. سرکشیدن، بلعیدن، سرکشیدن مایعات و غذاها.
**ماشتن**: *mâšten* قووتداو هەڵماشین. سرکشیدن مایعات.
**ماشین**: *mâšin* ماشتن، بە تونەدی خواردنەوە. سرکشیدن مواد غذایی از نوع مایعات.
**ماشین**: *mâšin* ترومبیل، ئۆتۆمبیل، سەیارە. اتومبیل، هرنوع وسیله صنعتی که دارای چرخ باشد و کاری را جا به جا کند یا ابزاری را با آن تولید کنند.
**ماشینی**: *mâšini* بەسراوە ماشین. ماشینی، منسوب به ماشین.
**مافەته**: *mâfata* جۆری کرمه که ماڵات لەگەڵ گیا دەیخۆن دواجار تووشی نەخۆشی دەبن. حشره ای که لارو آن به دور خود خار و خاشاک می‌تنند و مانند لوله ای تا رشد کامل در آن می‌ماند سپس پرواز می‌کند اگر دام در زمان لارو از آن بخورد سمی ترشح می کند که موجب مرگ دام می شود لذا برای دام بسیار خطرناک است.
**ماق**: *mâq* ها، وروکاس. خیره، مات، متحیر.
**ماقووڵ**: *mâquĭ* نەجیب، زۆر خاوەن ڕێز. معقول، با ادب، نجیب، با شخصیت.
**ماکوان**: *mâkawân* نێوی چیایەکه له دەوروبەری شاری جوانڕو. ماکوان، کوهی به همین نام در غرب شهرستان جوانرود از توابع کرمانشاه که مشرف به رودخانه سیروان است.
**ماکۆ**: *mâkō* جێگەی ماسوولکه. ماکو بافندگی، نام شهری در آذربایحان.

**ماکەر**: *mâkar* کەری مێ. الاغ مادە، مادە خر.
**ماکەو**: *mâkaw* کەوی مێ. کبك مادە.
**ماگ**: *mâg* ماو، وەکو (چوار رۆژی ماگە). ماندە، باقی، مانند (چهار روز ماندە است).
**ماگە**: *mâga* ماوە. ماندە است، هنوز ماندە.
**ماگی**: *mâgi* هەرماوی، ماوی. زندەای، ماندەای.
**ماڵ**: *mâĭ* خانوو، سامان. مال، خانە، ملك، دارایی.
**ماڵئاوایی**: *mâĭ âwâi(i)* خودا حافزی. خداحافظی.
**ماڵات**: *mâĭât* ئاژەڵ. دام، احشام.
**ماڵان**: *mâĭân* ماڵگەل، وەکو (گەورە ماڵان). خانەها، خانوادەها، مانند (بزرگ خاندان)
**ماڵان**: *mâĭân* داماڵان. مالیدن.
**ماڵاندن**: *mâĭânden* داماڵین. مالاندن.
**ماڵانن**: *mâĭânen* ماڵاندن، ماڵین. مالاندن، مالیدن.
**ماڵ بە ماڵ**: *mâĭbamâĭ* ماڵەوماڵ. خانە بە خانە.
**ماڵخراو**: *mâĭxerâw* ماڵ خراپ. خانە خراب.
**ماڵدار**: *mâĭdâr* ساماندار، ئاژەڵدار. چوبدار، ثروتمند، خانەدار.
**ماڵداری**: *mâĭdâri* سامانداری، ئاژەڵداری. چوبداری، ثروتمندی، بە حساب خرج کردن، خانەداری.

**ماڵش**: *mâĭeš* ماڵشت. مالش.
**ماڵشت**: *mâĭešt* مشتوماڵ، شێلانی لەش. مشتومال، ماساژ.
**ماڵشدان**: *mâĭešdân* ماڵشتدان. مالش دادن.
**ماڵ فرۆش**: *mâĭferōš* ئەوەی کە خانوو دەفرۆشێ، فرۆشیار. ماڵفروشی، فروشندە.
**ماڵکانە**: *mâĭekâna* داهاتی ماڵك. مالکانە، حق دریافتی بابت ملک مربوط بە مالک.
**ماڵکاول**: *mâĭkâwel* ماڵڕووخاو. خانە خراب.
**ماڵکردنەوە**: *mâĭekerdenawa* خانووکردن. خانە سازی کردن.
**ماڵگەل**: *mâĭgal* ماڵان. خانەها، خانوادەها.
**ماڵ لەیەك**: *mâĭlayak* شەریك، برابەش. شریك، کنایە از دوست جانی.
**ماڵم**: *mâĭem* مالێ من. مال من، خانە من، ثروت من.
**ماڵ ماڵ**: *mâĭmâĭ* تاقەتاقەی ماڵ، خانوو خانوو. خانە خانە، شطرنجی.
**ماڵومنداڵ**: *mâĭumenâĭ* ماڵومنداڵ، خاووخێزان. اهل خانە، خانە و خانوادە.
**ماڵ وحاڵ**: *mâĭuĥâĭ* باری ژیان، گوزەران. وضعیت و حال.
**ماڵومیرات**: *mâĭumirât* سامان و دارایی بەجێ ماو لە مردوو. ارث و دارایی بە جا ماندە از متوفا.

**مـــــالووم**: *mâlum* پەیـــــدا، دیـــــار، وەدەرکـــەوتوو، زانـــدراو. معلـوم، عیـــان، آشکار، پیدا.

**ماڵ وێران**: *mâĭwērân* ماڵ کاول، مـاڵ رووخاو. خانه خراب، اصطلاحـــی دال بــر شخصـــی که کاری ناروا انجام داده باشد.

**ماڵە**: *mâĭa* نەخۆشی پێستیی ژنـانی پـا بەزێ. نوعی بیمــاری پوســتی کـــه بــه صورت لکــههای سفید رنگ در صــورت ظاهر میگــردد بیــشتر در میــان زنــان آبستن رایج است.

**ماڵـــــە**: *mâĭa* ئـــامرازی ســـواخدان و سپیکارییه. ماله بنایی، ابزاری که بناها با آن گل یا گچ را می مالند.

**ماڵەکاری**: *mâĭakâri* کاری ماڵە کێشان. کار با ماله.

**ماڵەکێشان**: *mâĭakēšân* ماڵە کێشوان. ماله کشیدن.

**ماڵەکێـــشی**: *mâĭakēši* لووســـــکردنی قوڕبه ماڵە، ماڵەکێشان. ماله کشیدن.

ماڵەوماڵ: *mâĭawmâĭ* ماڵ بە کۆڵی. از خانهای به خانهای، خانه به دوش.

**ماڵەوماڵکردن**: *mâĭawmâĭkerden* ماڵ بـه مـاڵ چـوون. از خانـهای بـه خانـه دیگر رفتن.

**ماڵـەوە**: *mâĭawa* ئاماژەیـــە بـــۆ مـــاڵ، ئاماژیـە بـۆ ژنـی پیـاو لـە زاری پیـاوەوە. انــدرون مــسکن، کنایــه از همــسر مــرد از زبان مرد.

**ماڵی**: *mâĭi* تایبـەت بـە مـاڵ، دەسـتکردی ناو مـاڵ. مخصوص به خانــه و خانــه دار، خانگی.

**ماڵیاگ**: *mâĭyâg* ماڵراو. مالیده شده.

**ماڵیاوا**: *mâĭyâwâ* مـالێ ئـاوا، وتـەیەکـە بۆ سپاس لە شاباش کـردن. خانـهاش آبـاد، شاد باش.

**ماڵین**: *mâĭin* ماڵاندن. مالیدن، روبیـدن، زدودن.

**ماڵینەوە**: *mâĭinawa* سەرلەنۆی ماڵین. دوباره مالاندن یا سایش دادن.

**مامـان**: *mâmân* ژنــی یارمەتیــدەر لــە کـاتی زایـن و منداڵبوونـدا، قابلـە. مامـا، قابله.

**مامانەگـــــــــــــێجێ**: *mâmânagējē* بـاوەخولێ، سـووڕ خـواردن بـە دەورخـۆدا. چرخیدن سریع به دور خود بـــه صـــورت ممتد.

**مـــامر**: *mâmer* مـــر، مریـــشك. مـــرغ خانگی.

**مامربـاز**: *mâmerbâz* کەسێك کـە زۆر حەز لـە بـە خـێو کردنـی (مـر) بـێ. مـرغ باز، کسی کـه بـه مـرغ علاقهمنـد است و آنرا پرورش و نگهداری میکند.

**مامۆ**: *mâmō* مام، برای باب. عمو، برادر پدر، عم.

**مامۆسـا**: *mâmōsâ* مامۆسـتا. اصـــطلاح احترام آمیز خطاب به مرد روحانی.

**مامەڵـە**: *mâmaĭa* سـەودا، موعاملـە. معامله، داد و ستد.

**مامەڵە پەشیمانی**: *mâmaĭapašimâni* بڕە پارەیەك کە وەك سزا بۆ لایەنی پەشیمانی لە مامەڵەدا دیاری کراوە. پشیمانی در معامله، مبلغی بابت پشیمانی در معامله.

**مـان**: *mân* دەسـت هـەڵگرتن لـە ئـێش و کـار. امسـاک، خودداری کردن از انجـام کاری و در اصـطلاح امـروز بـه معنـای اعتصاب است.

**مان**: *mân* گێژ. گیج و منگ.

**مان**: *mân* لە بـەین نەچوون، نەچوون. ماندن.

**مانعـا**: *mân â* مانـا، وەکـو (مانعـای ئەوقسە چەس). معنی،ماننـد (معنی آن گفته چیست).

**مـــانگ**: *mâng* مـــانگی ئاسمـــان، ســـی ڕۆژتەواو. ماه، یکی از کُرات آسمانی، سی روز تمام

**مانگا**: *mângâ* چێڵ، گای مێ. ماده گاو.

**مانگـــار**: *mângâr* مـــاو، هەنووکـــەیی. ماندگار، ابدی.

**مانگان**: *mângân* چەند مانگ. ماەها.

**مانگانە**: *mângâna* مانگێ جارێ، مانگ بە مانگ، مووچەی یـەك مـانگ. ماهیانـە، ماه به ماه، حقوق یك ماه.

**مانگ تازە**: *mângtâza* مانگی نوێ. ماه نو، ماه جدید.

**مـانگ چواردە**: *mângčwârda* مـانگی چواردە. ماه شب چهارده، بدر تمام.

**مـــانگرتن**: *mângerten* گـــرۆ گـــرتن، پەڵپ گرتن، دەستهەڵگرتنی گشتی لە ئیش بەمەبەســتی گەیــشتن بــە داخــواز یــان داخوازەکان. خودداری کردن از هر کاری، اعتصاب کردن برای رسیدن به خواسته، اعتراض و دلخوری هم معنی می دهد.

**مانگ گیریان**: *mânggeryân* گیردران و نادیار بوونی مانگ لە شەودا. خسوف، ماه گرفتگی.

**مانگەشەو**: *mângašaw* تیشکی مـانگ، تریفە. مهتاب، نور ماه.

**مانگەومانگ**: *mângawmâng* مـانگێ جارێ، مانگ بە مـانگ. ماه بـه ماه، بـرج به برج.

**مـانگێ**: *mângē* یـەك مـانگ، سـی ڕۆژ تەواو. یك ماه، سی روز تمام.

**مانن**: *mânen* ماندن، لە سـەر پـێ مـان، ماو. ماندن، پابرجا بودن، باقی بودن.

**مانـــــەوە**: *mânawa* جـــــێگیربوون، نەڕۆیشتن. ماندن، باقیماندن.

**مانی**: *mâni* ماندوو، مانـدوویی. خسـته، ماندگی، مانده.

**مانیـاگ**: *mânyâg* مانـدووکراو. خـسته شده، مانده شده، وامانده.

**مانیــــاگی**: *mânyâgi* ماندوویــــەتی، ماندوویی. خستگی، ماندگی.

**مــــانیبوون**: *mânibun* مانــــدووبوون. خسته شدن، مانده شدن.

**ماوت**: *mâwet* کووتاڵێکی زۆر کوڵکدارە. ماهوت، نـوعی پارچـه ضـخیم پـشمی پُرزدار

**ماهــەك**: *mâhak* جــۆرێ نەخۆشـــیی پێستی. نوعی بیمـاری پوسـتی کـه بـه

صورت جوشــهای زیرپوســتی ناشــی از بیماری سرخجه، سرخک، آبله به وجــود می‌آید.

**مــای**: *mây* مــای، نه‌چــووی. مانــدی، زنده‌ای، مانده‌ای.

**مایــچه**: *mâyča* ماســوولکه، ماهیــچه. ماهیچه، عضله.

**مایده‌شت**: *mâydašet* نـێوی باژێـرێکه لـه کرماشـان. ماهیدشـــت، منطقـــه‌ای حاصلخیز در کرمانشاه.

**ماین**: *mâyen* ماوین، زیندووین، هـه‌ین. ماندیم.

**ماین**: *mâyen* ئه‌سپی مێ. مادیـان، اسـب ماده.

**ماینـدۆڵ**: *mâyandōĭ* نـێوی گوندێکـه. نام روستایی از توابع سنندج.

**ماینه**: *mâyena* له جنسی مێ. مادینـه، جنس ماده.

**مایــــه‌دار**: *mâyadâr* بــــریتی لــــه پووڵداریان پاره‌دار. مایــه دار، کـــنایه از کسی که دارای توانایــی خــاص مــالی و معنوی است.

**متمانـه**: *matmâna* خاترجـه‌می، بـڕوا پێ کـردن. اطمینان خاطر، خــاطرجمعی، آسودگی خیال.

**متــــه‌وه‌جی**: *matawaji* پاراســــن، هوشیــــاربوونه‌وه، ئاگـــاداربوون لــــه نهێنییه‌ك. نه‌هینێك. مواظبت، حفاظـت، نگهداری.

**مجرۆ**: *majrō* برینـار، برینـدار، زام دار. مجروح، خسته، زخمی.

**مجــری**: *mejri* ســه‌ندووقی چــکوله. مجری، صندوقچه درب دار و پایه فلــزی که مخصوص وسایل آرایشی و زیور آلات زنانه است.

**مـڕ**: *meŕ* مـاتبوون دوای تێـری. لمیـدن از سر سیری، اخم کردن، خیره.

**مرئاوی**: *mer âwi* مـراوی باڵنده‌یه‌کـه. مرغابی، پرنده‌ای که در آب شنا می‌کند.

**مراخــانی**: *merâxâni* جـوڕێ کــه‌وای پیاوانه. نوعی قبای مردانه.

**مران**: *merân* به کوشـتدان، کـوژران بـه گشتی، کوژران. میراندن، کشتن.

**مرانن**: *merânen* مراندن، کوشتن. کشتن، میراندن.

**مــڕ بردنــه‌وه**: *meŕberdenawa* واق مان، چاو بزکردنه‌وه. خیره نگاه کردن.

**مڕبــوون**: *meŕbun* تــه‌واو تــێربوون. حــالتی از فــرط ســیری کــه ســستی و کسالت در حرکت ایجاد می کند.

**مرچه**: *merča* ملچه، ده‌نگی ده‌مولێو له کاتی خواردندا. مرچ، صدای لــب،ماننــد صدای ماچ، صدای سرکشیدن مــایع بــا زبان.

**مرچه مرچ**: *merčamerč* ملچه ملچ. صدای پیاپی.....

**مرخانن**: *merxânen* مرخاندن. خرخر کردن، صدای بینی.

**مــرخن**: *merxen* مرخنــه، مرخه‌کـه‌ر. خرخر کن، خرناسه کن.

**مرخــه‌ك**: *merxak* کـه‌ڵاڤی هه‌ڵواسـراو به‌دار ته‌ونه‌وه. کلاف نخ آویـزان شـده بـر دار قالی.

**مردار**: *merdâr* مردنی بی سەر بڕین ئاژەڵ و مریشك. مردار، حیوان یا جانور مرده که ذبح نشده باشد.

**مردارەوبوو**: *merdârawbu* مردنی بە بێ سەر بڕین بۆ مریشك و ئاژەڵ. مردار شد.

**مردارەوبووگ**: *merdârawbug* مردارەوکراو. مردار شده.

**مردارەوبوون**: *merdârawbun* مردار بوونەوە. مردار شدن، کنایە از بە خواب رفتن کسی.

**مردارەوکریاگ**: *merdârawkeryâg* مردارەوکراو. مردار شده.

**مردگ**: *merdeg* مردوو. مرده، فوت شده.

**مردگ شۆر**: *merdegšōr* مردووشۆر. مرده شور، مرده شوی.

**مردگ موار**: *merdegmwâr* تواشا (مردەمە وار). نگاه (مردەمە وار).

**مردگ و زینگ**: *merdeguzineg* مردوو و زیندوو. مرده و زنده.

**مردن**: *merden* ها، گیان لەلەش دەرچوون. مردن، مرگ.

**مردوو**: *merdu* گیانی دەرچووبوو، مردبوو. مرده بود، در لهجه سورانی به معنای مرده.

**مردەڵە**: *merdaĭa* لاواز، لەڕ. لاغر، مردنی.

**مردەمەوار**: *merdamwâr* تازیەدار. سوگوار، عزادار، صاحب عزا.

**مرسە**: *mersa* لەناوچوون. از بین رفتن.

**مرشۆ**: *meršō* گێڕوەی چیڕۆکەکانی شانامەی فێردەوسی یەکێ لە وەرگێڕە بەناوبانگەکانی ئێران (مرشۆ باقر) کە خەڵکی شاری سنە بوو. مرشد، نقال شاهنامه، یکی از بزرگترین نقالان شاهنامه درایران مرحوم (مرشد باقر محمّد نژاد) است که از اهالی سنندج بود.

**مرشۆ**: *meršō* پیری تەریقەت، کەسێکە لە زۆرخانە بۆ هاندانی وەرزشکاران شیعری حەماسی و پڕ جۆش وێڕای موسیقا دەخوێنێتەوە. مرشد، پیرطریقت، مرشد زورخانه.

**مرقان**: *merqân* دەنگی مریشك، دەنگ دەرهێنان لە گەروو. صدا در گلو با دهان بسته.

**مرقە**: *merqa* دەنگی مرق. نگاه مرقان.

**مروار**: *merwâr* ئاو مرواریی چاو. آب مروارید، آب سیاه چشم.

**مرواری**: *merwâri* مرواری، نێوی ملەیەکە لە نێوان کامیاران و سنە. مروارید، گوهری درخشان و سفید رنگ که در درون صدف دریایی به وجود می‌آید، نام گردنه ای در مسیر جاده سنندج و کامیاران.

**مرۆچانە**: *merōčâna* تەزوخۆری پێست بەهۆی سەرماوە. مورمورکردن دست و پا بر اثر اختلال در جریان خون.

**مرۆچە**: *merōča* میلۆرە. مورچه، یکی از انواع حشرات.

**مرۆچـــــــــەکردن**: *merōčakerden* تەزوخۆریکردنی پێست بەهۆی سەرماوە. مورمورکردن دست یا پا بر اثر سرما.

**مرومـــشت**: *meŕumešt* گێرەوکێــشەی دەم بـەدەمی لـە نـێوان دووکەس. جـدل، مشاجره لفظی یا دستی.

**مـــــرە**: *meŕa* دەنگـــی ســـەگ یـــان زینـدەوریکیتر. غریـدن سگ و حیوانـات مشابه.

**مـــری**: *meŕi* تـێری و پـــری، واق مـان. حالت کرختی ناشی از سیری زیاد، خیره ماندن.

**مریــەم**: *meryam* ناوێـــکه بـۆ ژنـــان، ناوێکه بۆ گوڵێك. مریم، نام زنانــه و یکی از انواع گــلها که سفید رنگ و خوشــبو اســت و بوتــه آن پیــاز دارد، نــام مــادر حضرت عیسی.

**مزگانی**: *mezgâni* مزگێنی. مژدگـانی، انعـام و پاداشـی کـه در برابـر آوردن خـبر خوش به کسی بدهند.

**مزگانیدان**: *mezgânidân* مزگێنیدان. مژدەدادن، نگاه مزگانی.

**مزگـــت**: *mezget* مزگـــەوت. مـــسجد، عبادتگاه مسلمانان.

**مزگـــت جامـــێعا**: *mezgetjâmē â* مزگەوتی جومعـە. مسجد جمعه، جـایی که مسلمانان یک شهر نماز جمعه را بــه جــای مــیآورنــد، مــسجد جــامع یــا دارالاحســان سنندج یکی از زیباتــرین آثارتاریخــی سنندج است کــه در ســال ١٢٢٨ ه. ق به دستــور امــان الله خـــان اردلان والی مقتــدر کردســتان ســاخته شده است.

**مزگــەر**: *mezgar* کەسـێك کـە کـاری مـسینه دەکا. مـسگر، کسی کـه از شـغل او تولید وسایل مسی است.

**مزەڕەت**: *mezaŕat* بەڵا. آسیب، صدمه، بلا.

**مــزەوەر**: *mezawar* فـێڵباز، ئاوژێــرکا، چەتوون. مزدور، موذی.

**مزێڕ**: *mezēŕ* زیاندەر، چەتوون. موذی، صدمەرسان، مضر.

**مژ**: *mež* تەم، هـەڵمی ئـاو. مـه، بخـار آب پراکنده در هوای نزدیك زمین.

**مژ**: *mež* مژ لێدان. مك زدن.

**مژتن**: *mežten* مژین. مك زدن، مكیدن.

**مــژن**: *mežen* مژێــنەر. مکنــده، مــك زننده.

**مژومۆر**: *mežumōr* چاوی کەم هانا. چشم کم دید بـا پلك خوابیـده چـشم کـم بینا.

**مژیاگ**: *mežyâg* مژراو. مکیده شده.

**مــژین**: *mežin* مژلـێدان. مکیــدن، مــك زدن.

**مس**: *mes* کانزایەکی سوور ڕەنگه که بـه کار سـەنعەت و پیـشه دێ. فلز مس، فلزی سرخ رنگ وبسیار سخت و محکــم کــه مصرف صنعتی دارد.

**مـــــسابقه**: *mesâbeqa* پێـــــشبڕکێ، کێبەرکێ. مسابقه.

**مسافر**: *mesâfer* ڕێبوار، کەسێك کە بۆ سەفەر دەچێ. مسافر، رهگذر، رهرو، سفر کننده.

**مسقاڵ**: *mesqâĭ* کێشانەیەکە بەرانبەر چوار گرام و نیو. مثقال واحد وزن معادل ۱/۱۶ برابر ۶۸۷۵/۴ گرم.

**مسقاڵە زەڕە**: *mesqâĭazaŕa* تۆزقاڵ. یک ذره کوچک از هر چیز.

**مسگەر**: *mesgar* مزگەر، کەسێ کە کاری مسینە دەکا. مسگر، نگاه مزگەر.

**مسینە**: *mesina* ئەو کەرەسەیە کە لە مس دروست کراوە. ابزار و آلات مسی، از جنس مس.

**مشار**: *mešâr* هەڕە، ئەڕە. ارەی نجاری، ابزاری برای بریدن چوب.

**مشت**: *mešt* مست، وەکو (مشت نموونەی خەرواره). مشت، مانند (مشت نمونەی خروار است).

**مشت لێدان**: *meštlēdân* مست لێدان. مشت زدن.

**مشتوماڵ**: *meštumâĭ* شێلاندن بە دەست. مشتومال، صیقل، ورزدادن.

**مشتومڕ**: *meštumeŕ* شەڕی دەم بە دەم. جدال، جدل، نزاع لفظی.

**مشتە**: *mešta* کەرەسەیەك کە بە کاری کەوش دۆز دێت. ابزاری مخصوص در کار کفش دوزی.

**مشتەکۆڵ**: *meštakōĭ* مستە کۆڵ. مشت گره کرده.

**مشتەکۆڵە**: *meštakōĭa* مستەکۆڵە. مشت گره کرده.

**مشك**: *mešk* جانەوەرێکی چکولە و زیان ڕەسان. موش، جانوری کوچک، پستاندار، جونده و موذی.

**مشکخوەر**: *meškxwar* بریتی لە کەسێ زۆر چالاك و کورتە بالا. موش خوار، کنایه از آدم چالاك و کوتاه قد.

**مشکۆڵ**: *meškōĭ* دژوار، ئەستەم. مشکل، دشوار، صعب، سخت، گرفتاری، مسئله.

**مشکۆڵەزمە**: *meškōĭazama* ئوبال گەردن. مدیون، مشکل الزمه.

**مشکە کوێرە**: *meškakwēra* مشکی دەشتودەر. موش کور، از موش خانگی بزرگتر است و معمولاً در صحرا و زیرزمین زندگی میکند.

**مشکی**: *meški* ڕەنگی ڕەش. مشکی، سیاه رنگ.

**مشن**: *mešen* کەسێ کە زۆرتر لە ڕێگای لووتییەوە، هەناسە دەدا. کنایه از کسی که از بینی تنفس می‌کند.

**مشنە**: *mešna* کەسێ کە بە هۆی تەنگە نەفەسییەوە دەنگ لە لووتییەوە دێ. تنفس با بینی، کنایه از کسی که با بینی تنفس می‌کند.

**مشە**: *meša* دەنگی گیردرانی لووت. صدای نفس در بینی.

**مشەما**: *mešamâ* شەم لێدراو، کەرەسەیەکی دروستکراو لە نایلۆن. مشمع، پارچه آمیخته شده به موم، یکی از انواع محصولات شیمیایی که مصرف صنعتی دارد.

**مفـت**: *meft* بـەلاش، بـیٚ نـرخ. مفـت، مجانی، رایگان.

**مفتخـوەر**: *meftxwar* مۆفتخـۆر. مفـت خوار، کسی که از دست رنج دیگری ارتزاق کند.

**مفت ویٚـژ**: *meftwēž* موفت ویٚـژ. مفـت گوی، دروغ گوی، هرزەگوی.

**مفـت ویٚـژی**: *meftwēži* موفـت ویٚـژی. مفت گویی، دروغ گویی، هرزەگویی.

**مفتـە**: *mefta* مفتـا، بـیٚ نـرخ، بـەلاش، مەرجانی. رایگان، مجانی، مفت.

**مفتـەخوەر**: *meftaxwar* مفـت خـوەر. فتخور، مفتخوار.

**مفتــە خــوەری**: *meftaxwari* موفــت خۆری. مفت خوری.

**مفتەکی**: *meftaki* بـی پـوولٚ کـڕین، بـی نـرخـی، مـوفتی. مفتکـی، رایگـان، بـدون پرداخت بها.

**مفتەویٚژ**: *meftawēž* وتەی پـڕۆ پـووچ، وڕاج، زۆر ویٚژ. مفت گوی، هرزەگوی.

**مفتـەی مفتـە**: *meftaymeft* موفتـەی موفت، زۆر موفت. مفت مفت، ارزان.

**مفتی**: *mefti* بـیٚ نرخـی، مـوفتی. مفـتی، بدون پرداخت بها.

**مفتی**: *mefti* مفتی، فتوادەر. مفتی، فتـوا دهنده.

**مفـەتیش**: *mefateš* پـشکینەر، سـیٚخوڕ. مفتش، جاسوس.

**مـەقام**: *maqâm* ها، شـیٚوەیەك ریـتم و ئاهـەنگ لـە موسـیقادا کـە لـە دسـتگاه بـچووکتر بـیٚ (حەمـە کەچـەڵی) و (پـا دیــواری) دوو مەقامــی بــە نــاو بانگـــی موسیـقـای فولکولـوری شـاری سـنەیە کـە مەقامبیٚژەکانی: (حەمە مزگـەر)، (بـاقری سیا) بوون.

حـەمـە عاشقـە ئـەهـای خەڵك شـار<br>
لـە بـەر ماڵ کـاڵیٚ بیٚـن بمکیٚشـنە دار<br>
(حەمەکەچەڵی)

ئەهـای خەوکـەران جەخـەو بن بیٚـدار<br>
گـوش دەن بـە دەنـگ ناڵـەی دەردە دار<br>
هەرکەسیٚ خەفتەن خەو لیٚش حەرام بۆ<br>
هەرکـەس بیٚدارەن دونیاش بە کـام بۆ<br>
(پا دیواری)

مقام، نــوعی ریــتم و آهنــگ خــاص در موسیقی کــه از نظــر تنــوع از دســتگاه کــوچکتر اســت، مقامهــای مــشهور موسیقی: موسیقــی کُـردی، قه تار، ا للّه وه یسی، خاوکه ر، پا دیواری و....

**مقـام**: *maqâm* مقـام، پلـە، پایـە. رتبـه، مقام، جایگاه.

**مقـاو**: *maqâw* نەخۆشـیی یـەك سـم. نـــوعی بیمـــاری در ســـتور شـــبیه سرماخوردگی در انسان.

**مقـۆ**: *meqō* پـچە. نجـوا، درگوشـی، پــچ پچ.

**مقۆمقۆ**: *meqōmeqō* پچە پچە کردن. نجوا کردن، درگوشی صحبت کــردن دو نفر، پچ پچ کردن.

**مقــەوا**: *maqawâ* مقــەبا. مقـــوا، از محصولات چوبی که از کاغذ ضــخیم تــر است.

**مەلاز**: *maĭâz* خۆداگرتنی جانەوەر بۆ ڕاو. کمین، نگاه کردن با اشتیاق، کمین کردن حیوانات شکاری.

**ملچ**: *meĭč* مرچ، مرق. صدای لب و لوچه.

**ملچاندن**: *meĭčânden* مرچاندن. صدای دهان به هنگام خوردن یا نوشیدن.

**ملچە**: *meĭča* مرچە. صدای لب و لوچه، مرچه.

**ملچێ**: *meĭčē* کەسێ کە زۆر دەملچێنێ. کنایه از کسی که در خوردن یا صحبت کردن از لب و لوچه‌اش صدا در می‌آورد.

**ملق**: *meĭq* مرق. مك، یکبار مکیدن.

**ملقە**: *meĭqa* مرق لێدان. مک زدن، صدای مک زدن.

**ملك**: *meĭk* ماڵ، دارایی. ملك، مال، دارایی.

**ملکانە**: *meĭkâna* داهاتی دەرەبەگ و خاوەن ملك. مالکانه، اجاره ملك.

**ملکەج**: *melkaj* لارەمل، خەمبار، کز. گردن کج.

**ملنەدان**: *melnadân* قبووڵ نەکردن، خۆبەدەستەوەنەدان. گردن ننهادن، تسلیم نشدن.

**ملنیان**: *melniyân* ملنیان، خۆبەدەستەوە دان. گردن نهادن، تسلیم شدن در برابر چیزی.

**ملوانك**: *melwânek* گەردن بەند. گردن بند، زیورآلات رشته شده برگردن زنان.

**ملۆزم**: *meĭōzem* دژ، دژمەن، دوژمەن. دشمن، ضد.

**ملوێن**: *melwēn* ملوێن، یەك هەزار هەزار. میلیون.

**ملوێنك**: *melwēnek* ملوانکە. گردن بند، نگاه ملوانکه.

**ملە**: *mela* بستوو، زینە، ڕێگای دژواری کێو. گردنه، پیچ خطرناک راه، راه صعب العبورد.

**ملەت**: *melat* نەتەوە، گەل. ملت، مردم یك کشور.

**ملەتاتکێ**: *melatâtkē* سەرەتاتکێ. گردن کشیدن، سرك کشیدن.

**ملەهوڕ**: *melhoŕ* گەردنکەش، یاخی، کەسێ کە یاسا و قانوون شکێنە. گردن کش، گردن کلفت.

**مناڵ**: *menâĭ* منداڵ. فرزند، بچه، پور.

**مناڵانە**: *menâĭâna* منداڵانە، تایبەت بە منداڵ. بچگانه، آنچه که منسوب به بچه باشد

**مناڵبوون**: *menâĭbun* منداڵبوون. کودك بودن، کم سن و سال بودن.

**مناڵدار**: *menâĭdâr* منداڵدار، خێزان بار. عیالوار، بچەدار.

**مناڵە وردکە**: *menâĭawerdka* منداڵە ورتکە. بچه‌های قد و نیم قد، کودکان.

**منجێڵە**: *menjēĭa* مەنجێڵە. کک مک، لکه های قهوه ای رنگ روی پوست صورت و قسمت های مختلف بدن.

**منجێڵەدار**: *menjēĭadâr* مەنجیڵەدار. پوست کسی کە لکە های قهوەای رنگ داشتە باشد.
**منگ**: *meng* دەنگێکی نێو لووت. صدای تودماغی بر اثر انسداد حفره های بینی.
**منگن**: *mengen* کەسێ کە لە نێو لووتدا قسە دەکا. کسی کە تو دماغی حرف بزند.
**منگە**: *menga* بەلووت قسەکردن. حرف زدن تو دماغی.
**منگە منگە**: *mengameng* منگ منگ. تودماغی حرف زدن متوالی.
**مـن مـن**: *menmen* خـۆ هەڵکێـشان. خودستاتی کردن، تردید کـردن هـم معنی میدهد.
**مـن و تـۆیی**: *menotōi* شـەڕە قـسەی نێوان دوو کەس. من و تـو کـردن، ضـد یگانگی، جدل لفظی کردن.
**من و تۆ**: *menutō* هەردووکمان. مـن و تو، من و شما، فقط ما دو نفر.
**منـــەت**: *menat* چـــاکەکردن و بەچـاودادانەوەی. منـت، نیکـویی کـردن کـسی نـسبت بـه کـسی دیگـر و بـەرخ کشانیدن این کردار به او.
**منەتبار**: *menatbâr* منەتـدار. منتبـار، سپاسگزار.
**منەتـدار**: *menatdâr* منـەتبار. منـت دار.
**منــەت هــەڵگرتن**: *menathaĭgerten* منەت کێشان. منت کشیدن.

**منـیچ**: *menič* ئـەمنیش، منـیش، وەکـو (منیچ لە تەکتا تێم). من هم، مانند (مـن هم همراه تو میآیم).
**منیش**: *meniš* منیچ، وەکو (منیش تـێم بۆ لاتان). من هم، مانند (من هم بـه شما ملحق میشوم)
**مـوارەك**: *mwârak* مومبـارەك. مبـارك، فرخنده، میمون.
**موارەکبـایی**: *mwârakbâi(i)* موبارکبـایی. مبارک بادی، هدیه دادن به خـاطر یـک رویداد فرخنده.
**مواقـف**: *mwâfeq* مـەواقف، مـەدیون. مدیون.
**مۆتە مۆت**: *mōtamōt* سەرکێشاندن. سرك کشیدن.
**مۆجگاری**: *mōjgâri* ئامۆژگاری. انـدرز، پند دادن.
**مۆجیاری**: *mōjyâri* ئامۆژگـاری. انـدرز، پند دادن.
**مۆچیاری**: *mōčyâri* ئامۆژگـاری. اندرز، پند، نصحیت.
**مۆچیاری کریـاگ**: *mōčyârikeryâg* ئامۆژگاریکراو. اندرز داده شـده، پنـد داده شده.
**موحێبەت**: *mohēbat* موحبەت. محبت، مهر، دوستی، میل به سوی چیزی یا کسی.
**مۆخ**: *mōx* مێشك، ئـەوەی وا لـە کاسـەی سەر یا لە نـێوی ئێسقاندایە. مغـز، نخـاع، مخ، مایع لزج درون استخوان.
**موخـۆڕ**: *moxōŕ* دەرمـان حـەمام لـە قەدیمـدا. ثمـردرخت (ون) که زنـان بـه

جای واجبـــی از آن استفاده می کردنـــد این ماده خاصیت چسبندگی دارد.

**مـوده**: *moda* دەرفـەت، مـاوە. مـــدّت، فرصت، زمان.

**مۆر**: *mōr* مۆر، موهر. مُهر.

**مۆڕ**: *mōŕ* به چاوی زەق روانین، روانینی به قین. نگاه کردن و خیره مانـدن از سـر خشم، ملاز.

**مۆرکردن**: *mōrkerden* مۆرنان لەسـەر کاغەز. مهر کردن، نگاه مۆر.

**مۆرکریاگ**: *mōrkeryâg* مۆرکراو. مهر شده، نگاه مۆر.

**مـۆره**: *mōra* مـۆره وەکو ئـەوەی کـه لـه (تاوڵه) تەختە نەرد دایه، مـۆرەت. مهـره، گلوله کوچك سوراخ دار و بدون سوراخ.

**مـــۆره مـــۆر**: *mōramōr* خوێـــندنی ژێرلچی. زمزمه، ترنم، آواز زیـر لـب، ورد آهنگین.

**مۆژگـاری**: *mōžgâri* مۆچـیاری. پنـــد دادن، نصیحت کردن.

**موســـڵمان**: *moseĭmân* موســـلمان، پـەیرەوی ئـاینی ئیـسلام. مـسلمان، پیـــرو آئین اسلام.

**موعـەلم**: *mo alem* فـێرکار، مامۆسـتا. معلـم، تعلـیم دهنـده، آموزگـار، آمـوزش دهنده.

**موفاجـات**: *mofâjât* مـەرگی لـه ناکـاو. ناگهانی، مرگ ناگهانی.

**موفتی**: *mofti* فتوادەر، عالمی ئاینی. فتوا دهنده.

**موقـەدەر**: *moqadar* رووداوی خـوایی. مقدر، تقدیر، سرنوشت.

**موکریـــان**: *mokreyân* مەڵبەندێـکی پانوبەرین له کوردستان. منطقه مُکریـان در کردستان حد فاصل آذربایجان غربی و شهرستان سقز.

**مـــۆڵ**: *mōĭ* کۆبوونـــەوە بـــەدەور خـــۆ، بەدەور خۆدا پێچراو. دوره، چنبره.

**مۆڵ خـواردن**: *mōĭxwârden* بـەدەور خۆدا پێچراو. چنبره زدن.

**مۆڵـەت**: *mōĭat* مـاوە، کـات. مهلـــت، فرصت، زمان دادن.

**مۆڵـەق**: *mōĭaq* بەشـێکی زۆر لـه شـتێ، نـــەختێ لـه شـتێ، وەکـو (مولەقـێك لـەو گوڵه). مقدار، مقداری از چیزی، کثیـــر و انبوه هم معنی می‌دهد، مانند (مقداری از آن گل).

**مۆڵەقێ**: *mōĭaqē* بەشێکی زۆر لەشتێ. مقداری، انبوهی.

**مۆڵـــەقێك**: *mōĭaqek* بەشـــێکی زۆر لەشتێ. مقداری، انبوهی از چیزی.

**مۆم**: *mōm* ها، شەم. مـوم، ماده ای زرد رنگ که زنبور عسل تولید می‌کند، تفاله عسل که پس از تصفیه عسل بـه دسـت می‌آید.

**مۆمدان**: *mōmdân* شەمدان. جای مـوم، موم دانی.

**مۆمن**: *mōmen* خوداپەرست، ئیمانـدار. مؤمن، با ایمان، معتقد.

**مۆمنـــایی**: *mōmnâi(i)* مومیـــایی، مۆمنایی. مومیایی.

**مۆمیـــــایی:** *mōmyâi(i)* مۆمنـــــایی. مومیـــایی، مأخوذ از یونانی، مادەای سیاه رنگی که جسد انسان را بـــه آن آغـــشته کرده تا آنرا بـــرای مـــدت زیـــادی حفـــظ کنند.

**مونتەها:** *mōntahâ* بەڵام، لە ئاکامدا. منتها، امّا.

**مـــۆنی:** *mōni* رووگـــرژی. بـــد اخمـــی، عبوسی.

**موو:** *mu* موو، قـژ. مـو، تارهـای باریـك و نازك که در سر و اندام انسان میروید.

**مـووچ:** *muč* مەچـك، مـست. مـچ، مـشت هم گفته می شود.

**مووچ:** *muč* ها، دەقکردن. تا، تا کردن.

**مووچاندن:** *mučânden* چەماندن. خم کردن.

**مووچانن:** *mučânen* چەماندنەوە. خم کردن، تا کردن.

**مووچرك:** *mučerk* تەزووی لـەش. لـرز، تیر کشیدن سریع بدن.

**مووچیاگ:** *mučyâg* مووچاو، چەماو. تا شده، خم شده.

**مووچـــــــــــــیانەوە:** *mučyânawa* مووچرانەوە. خم شدن دوباره.

**موورا:** *murâ* کووژەکەی شـین، نیۆیەکـه بـۆ کـچان. مهـره بـرای چـشم زخـم، نـامی زنانه.

**مــــوورگ:** *mureg* مـــــەنجۆق، مــــوورو. منجوق، دانەهای رنگینی کـه بـرای تـزئین لباس زنان و تزئینات به کار میرود.

**موورگەبا:** *murgabâ* جـۆرێ مـوورووی سـپی کـه بـه پـیروز دادەنـرێ. مهـــره ی سفید رنگ خوش یُمن در اصطلاح عامه.

**مووســا:** *musâ* پەیغەمبـــەری یـــەهوود، ناوە بۆ پیاوان. موسی، نـامی مردانـه، نـام پیامبر یهودیان.

**مووســای:** *musâi* یـــەهوودی، پـــەیرەوی ئـــایینی یـــەهوود و حـــەزرەتی مووســـا. یهودی، پیرو دین یهود و آیین حـضرت موسی.

**مووسایبازی:** *musâibâzi* ئاماژەیـه بـۆ داو لـــێدر. کنایـــه از کـــسی کـــه دبـــه در میآورد.

**مووســـــــــــــاییەکان:** *musâiakân* جوولەکەکان، نێوی گەڕەکێکی شاری سنه. یهودیـان، نـام محلـەای بـه همـین نـام در سنندج که محل زندگی آنها بوده است.

**مووســـاییگەل:** *musâigal* پـــەیڕەوانی ئایینی حەزرەتی مووسا. یهودیـان،پیروان حضرت موســی (ع)، یکــی از پیــامبران بنیاسرائیل و صاحب کتاب تورات است.

**مووش:** *muš* بێ دەنـگ، کـپ. بـــی صـــدا شدن از ترس.

**مووشاندن:** *mušânden* بێ دەنگمان لـه ترسا. بیصدا بودن براثر ترسانیدن.

**مووشکردن:** *muškerden* بێ دەنگ مان له ترسا. سکوت کردن از ترس.

**مووشکریاگ:** *muškeryâg* کپـوکڕکراو، بێ دەنگکراو. بیصدا شده از ترس.

**مووشـــەك:** *mušak* چەکـێگی گـەورەی کۆکوژی، سارۆخ. موشك، یکی از سلاحهای

جنگی با قدرت تخریب فراوان و زیاد، یکی از آلات ترقه بازی با خرج باروت.

**مووین**: *muin* دروستکراو له موو، جێگایەك كە مووی زۆربێ. پُرمو، مودار.

**موهەندس**: *mohandes* ئەندازیار. مهندس.

**مەبادا**: *mabâdâ* نەکا. نکند، کنایه از هنگام ضرورت، مبادا.

**مەبال**: *mabâl* موستەراح. ستراح، توالت.

**مەتارە**: *matâra* دەفری تایبەت بۆ چا هەڵگرتن لە کاتی سەفەردا. فلاکس مخصوص چای و آبجوش.

**مەتە**: *mata* کەرەسەی سمین. از ابزار صنعتی که در نجاری و... مورد استفاده است.

**مەتەڵ**: *mataĭ* مەتەڵ. مثل، چیستان، ضرب المثل.

**مەتەڵەك**: *mataĭak* مەتەڵۆك، تەشەری هەجۆ ئامێز. متلک، شوخی، کنایه از سخنی که از روی شوخی و طعنه به کسی گفته شود.

**مەتەوکەوانە**: *matawkawâna* ئامێرێکە لە پیشەی ناسك كاریی چێۆ و خەراتی دا بە کار دێ. متە کمانی، یکی از انواع آلات نجاری و نازک کاری خراطی که متە بوسیله آن می‌چرخد.

**مەجاز**: *majâz* خدە، خۆ. سلیقه، عادت.

**مەجاڵ**: *majâĭ* ماوە، دەرفەت. مجال، فرصت، مهلت.

**مەجبوور**: *majbur* ناعیلاج. مجبور، ناگزیر، ناچار.

**مەجلێس**: *majlēs* کۆڕ، پارلمان، پەرلەمان. مجلس، پارلمان، ضیافت، در اصطلاح محل برگزاری نشست نمایندگان مردم یک کشور اتلاق می‌گردد.

**مەجومعە**: *majom a* مەجمە. سینی بزرگ غذا، مجمعه.

**مەجەلە**: *majala* گۆڤار، بڵاوە کراوەی مانگانە، وەرزانە یان... مجله.

**مەچەك**: *mačak* مچ، مفصل میان کف دست و ساق یا میان کف پا و ساق پا.

**مەچکە**: *mačka* مەچەك. مچ.

**مەچەل**: *mačal* بەسەر گێڕاندن، بەسەرگەڕاندن، لەسەر کردنەوە. مچل، بسر گردانیدن.

**مەحرەم**: *maĥram* ڕازدار. محرم، رازدار، سِر نگهدار.

**مەحز**: *maĥz* بۆ، لە بەر، بۆ خاتر، هەر بە تەنیا، وەکو (مەحز خاتر تۆ هاتم). به خاطر، مانند (فقط به خاطر شما آمدم).

**مەحزڕەزای خوا**: *maĥzŕazâyxwâ* بۆ خاتری خودا. به خاطر رضای خدا.

**مەحکووم**: *maĥkum* بە تاوانبار ناسراو. محکوم، کسی که حکم بر علیه او صادر شده باشد.

**مەحکەم**: *maĥkam* قایم، دەوامدار، بادەوام. محکم، با دوام، مقاوم.

**مەحکەمە**: *maȟkama* جێگای قازی، پزیشك، مەكتەب. محكمه، مطب پزشک، دادگاه، جای دادرسی.

**مەحـــەك**: *maȟak* مەهـــەك. محـــك، سنجش.

**مەحەل**: *maȟal* جێ، جێگا. محل، جای، جایگاه.

**مەحەلە**: *maȟala* گەڕەگ، وەكو (تۆ خەڵك كام مەحەلەی). محله، كوی، برزن، مانند (شما اهل كدام محله هستید).

**مەحەلـــە جـــەنگێ**: *maȟalajangē* جۆرێ شەڕ لە نێوان لاوانی دوو گەڕەگ لە قەدیمدا وەكو یاسایەكی جەنگی وا بوو. نگاه به مەحەلە شەڕی.

**مەحەلە شەڕێ**: *maȟalašaŕē* جۆرێ شەڕ لە نێوان لاوانی دووگەڕەگ كە باو بوو. نزاع دسته جمعی، جدال بچەهای دو محله با هم.

**مەحەلـــەق**: *maȟalaq* تەقڵەلێـــدان معلق، پشتك، وارو.

**مەخسوو**: *maxsu* مەبەست، ئامانج. مقصود، هدف.

**مەخسەرە**: *maxsara* گاڵتە. مسخره، استهزا.

**مـــەخلۆق**: *maxlōq* خـــەڵك، مـــەردم. مخلوق، مردم.

**مەخلۆقات**: *maxlōqât* مەردم بەگشتی، سەرجەمی خەڵك. مردمان، اناس.

**مەخمەسە**: *maxmasa* قەرقەش، ئەرك و دەرد، گێرەو كێشە. مخمصه، گرفتاری.

**مەخمەڵ**: *maxmaľ* مخمەر، كۆتاڵێكە. مخمل،پارچه ای لطیف نخی یا ابریشمی با پُرزهای نرم.

**مەخمەڵە**: *maxmaľa* نەخۆشییەكی پێستە. مخملک، نوعی بیماری پوستی به صورت دانەهای ریز در كشاله ران و اطراف گردن دیده می‌شود كه همراه با تب و لرز و درد گلو است.

**مەدرەسە**: *madrasa* قتابخانە، فێرگە، قوتابخانە. مدرسە، دبستان، جای درس خواندن و درس دادن.

**مەدرەسەی**: *madrasai* قتابی، قوتابی. دانش آموز.

**مەدەت**: *madat* مەدەت، مەدەك، فریاد كەوتن. مدد، یاری، كمک، مدت، فرصت.

**مـــەدەد**: *madrasa* یارمـــەتی، فریـــا كەوتن. مدد، یاری، كمك، فریادرسی، یار و یاور نیز گفته می‌شود.

**مەڕ**: *maŕ* پەز. گوسفند.

**مـەرام**: *marâm* مەبەست و ئارەزووی فیكر. مرام، عقیده، باور.

**مەرج**: *marj* شەرت، مرج. شرط، عهد.

**مەرجان**: *marjân* زیندەوەرێكە لە ئاودا دەژی، وەك رووەك وایـــە، نـــێوێكە بـــۆ ئافرەتان. مرجان، نامی زنانە، نوعی از جانوران آبزی در دریا كه شبیه گیاه است.

**مەرجانـــەی جـادوو**: *marjânayjâdu* ئاماژەیە بۆ ژنی فێڵبازی نێو چیرۆكە كۆنەكان. نام زن جادوگر افسانەای.

**مەرجكردن**: *marjkerden* شەرتكردن. شرط بندی كردن.

**مـەرحووم**: *marĥum* بـەڕەحمت چـوو. مرحوم، به رحمت خدا رفته، فوت شده.

**مەرحەبا**: *marĥabâ* مەرحەبا. مرحبا، سلام، درود.

**مەرحەمە**: *marĥama* حەوله. حولـه، پارچه ای نخی و پُـرزدار بـرای خـشک کردن دست و صورت پس از شستشو.

**مەرحەمـــــەت**: *marĥabâ* لوتــــف، گـەورەیی نوانــدن. مرحمـــت، لطـــف، مهربانی، بزرگواری کردن.

**مــەرخوز**: *marxoz* مەرخــەز، مــەرەز. موی بز، مرخوز که در منطقه بانه پرورش می‌دهند.

**مەرخوزار**: *marxozâr* مەرغوزار. مرغزار، چمن زار.

**مەرد**: *mard* مێرد. مرد.

**مەرد ئازا**: *mard âzâ* پیاوی دلێر. مرد شجاع و دلاور.

**مەردانـه**: *mardâna* پیاوانـه، کـرداری مرۆڤدۆستانه. مردانه، منسوب به مرد.

**مەردایـەتی**: *mardâyati* مـێردایەتی، پیاوەتی. مردانگی، کرامت، جوانمردی.

**مــەردم ئــازاری**: *mardem âzâr i*ئازاردانی خەڵك. مردم آزاری.

**مـــــەردمی**: *mardemi* مرۆڤایــــەتی، خـەڵکی. مردمــی، منــسوب بــه مــردم، طرفدار مردم.

**مەردۆخ**: *mardōx* مەردۆخ، نێوی یەکێ لـه بنەماڵـەکانی کـورد کـه نەخـشێکی گـــــەورەی لـــــه خزمـــــەت زانـــــسته جۆربەجۆرەکانـدا هـەبووە لـەم بنەماڵـه دەتـوانیـــن ئامـــاژە بەکەســانێ وەکـــو (ئایــەتوڵا مــەردۆخ) و (بابــا مــەردۆخ) بکـەین. نام خاندان مردوخی‌ها، یکــی از خانواده های اصیل و بزرگ کُرد که علما و مفسرین و دانشمندان زیـادی از ایــن خاندان برخاسته‌اند و تاریخ فرهنگ کُرد از جهات مختلف مدیون آنهاست، از این خاندان می‌توان از آیت الله مردوخ یکــی از دانشمندان بزرگ و بابا مردوخ صاحب کتاب سه جلدی مشاهیر کُرد نـام بـرد، برای مطالعه بیشتر بـه منـابع تـاریخی مراجعه گردد.

**مـــــەردوڕەنگ**: *mardurang* پیــــاوی فێڵباز و مفت خوەر. مرد رند، شیاد.

**مـەرد و مەردانـه**: *mardumardâna* مەردایـەتی، کـردەوەی پیاوانـه، پیـاوەتی. مـرد و مردانـه، اخـلاق و کـردار مـردی و جوانمردی.

**مــەردە**: *marda* مــردوو. مــرده، فـوت شده.

**مــەردی**: *mardi* مەردایـەتی، پیـاوەتی. مردی، مردانگی.

**مەرز**: *marz* سنوور. مـرز، حـد، سـرحد، در زبان ادبی کردی سنوور گفته می‌شود.

**مەرزە**: *marza* مەرزە، رووەکێکی کێویی بۆنخۆشـی بەهارییـە. آویـــشن کـــوهی، گیاهی خودرو که در ارتفاعات می‌رویـد، دارای ساقه‌های کوتاه و پر از برگهای ریز بسیار خوشبو که خاصیت ضـد عفـونی کننده گی دارد.

**مەرمەڕ**: *marmar* بەردی مەڕ مەڕ.

مرمـر، یکـی از انـواع سـنگها کـه دانـه‌های متراکـم بلـورین دارد و از نـوع سـنگهای آهکی است.

**مەرمـــەڕین**: *mármárin* بـەردی مـەڕ مەڕ. مرمرین، مزین به سنگ مرمر یـا از جنس مرمر.

**مەرەخـــەس**: *maraxas* ئاماژەیـە بـۆ کەسی هەرزە. مرخص، کنایه از آدم هرزه و ولگرد.

**مەرەخەســـــی**: *maraxasi* ئیـــــزن وەرگـرتن، ئیجـازە وەرگـرتن. مرخـــصی گرفتن، اجازه گرفتن.

**مــــەرەز**: *maraz* مــــەرەز، ناســــاقی، نەخۆشی. بیماری، مرض.

**مـەرەز**: *maraz* مـووی بزنـی مەرغـەز، مەرخوز. مرغوز، پشم بزی به همـین نـام که پشم آن بسیار مرغوب است.

**مەرەکەف**: *marakaf* مەرەکـەب. مرکب خطاطی.

**مەزاح**: *mazâĥ* گاڵتە. شـوخی، مـزاح، خوش طبعی کردن.

**مـەزار**: *mazâr* قـەبر، گـۆر. مـزار، گـور، مرقد.

**مـەزاق**: *mazâq* چێژ، ئیشتیا. ذائقــە، حس چشایی.

**مەزرێح**: *mazrēĥ* مەزراق، خولخوله. نوعی وسیله بازی شبیه گردنـای کـه از جنس چوب است به وسـیله دو نفـر بـه چرخش درمی‌آمد و صدادار بود.

**مەزە**: *maza* تام، چێژ. مزە، طعم.

**مــەزەب**: *mazab* مەزهـەب. مـــذهب، آئین، دین.

**مەزەدار**: *mazadâr* خۆش چێژ، بـەتام. مزه دار، خوشمزه، خوش طعم.

**مەزەنە**: *mazan* نرخ، مەزندە، بایی. ڤ، نرخ، قیمت، بها، مزنده.

**مەژگە**: *mažga* کاکل، کاکڵی گوێـز. مغز گردو، وسط نوعی نان گرده کـه از مغـز گردو در آن استفاده شده باشد.

**مەس**: *mas* مەست، سەرخۆشی بـە هـۆی خواردنـەوەی مەییـەوە. مـست، حـالتی از بیهوشـی و بـی‌خـبری ناشـی از خـوردن مسکرات.

**مەسـانە**: *masâna* مەسـتانە، کـردەوەی تایبــەت بــە هــۆی خواردنــەوەی مــەی، ڕەفتـاری تایبــەتی ســەرخۆش. مــستانه، همچو مست، مانند مست.

**مەســــــتوورە**: *mastura* نازنــــــاوی مـێژوونووس و شـاعیری گـەورە ماشـەرف خانم ئەردەڵان، ناوە بۆژنان.

خـەسرەوم وەهـار، خـەسرەوم وەهـار
یـا شـا نەیەوە ئیمسـاڵ نـەو وەهـار
بەر نـەیان وەبەر گـۆڵان جەگـۆڵـزار
نـەکـەرۆ درەخـت شکـۆفە ئیزهـار
موسەلسەل گیسووی پڕ جەعد سونبوڵ
لـەرزانـەن بـە نـاز پـەرێ دام دڵ
(مەستوورە)

تخـلص شاعــر و مــــورخ بــزرگ کُــرد مستوره ی کردستانـــی متولـد شهـــر سنندج (۱۲۲۰ت _ ۱۲۶۴ ف (ه.ق))، نامی زنانە.

ای سبزه نرسته از عذارت

این سبزه چه بود بر مزارت
(مستوره)

**مەسکردن:** *maskerden* مەستکردن. مست کردن، بیخود شدن، بیهوش شدن بر اثر مصرف الکل.

**مەسڵەحەت:** *masĭaĥat* تەدبیری باش. مصلحت، مشاوره کردن، آنچه کـه مایـه خیر و صلاح باشد.

**مەســـەب:** *masab* مەزهـــەب، ئـــاین. مذهب، آئین، کیش.

**مەسەڵەن:** *masaĭan* بۆ نموونە. مثلاً، برای نمونه.

**مەســـی:** *masi* مەســـتی، کـــردەوەی مەستانە. مستی، کـسی کـه از نوشـابه الکلی نوشیده باشد و از حالـت طبیعـی خارج و به حالت بیخود افتاده باشد.

**مەشـــخەڵە:** *mašxaĭa* گیرۆدەکـــاری، سەرقاڵی. گرفتاری.

**مەشـــرەوە:** *mašrawa* دەفرێـــك بـــۆ ئاوخواردنەوە. پارچ سفالی آب.

**مەشـــق:** *mašeq* نووســـینی دەرســـوانە، مەخش. مشق شبانه مدرسه.

**مەشـــق:** *mašeq* مـــەخش، مەشـــخ، ئامادەسازی سەربازی. مشق، تمرین، نظام جمع.

**مەشـكۆڵە:** *maškōĭa* مەشـکی گـچکە. مشك و خیك كوچك از جنس پوست بز و گوسفند.

**مەشکە:** *maška* خێگە، مەسکە. مشك، خیك از جنس پوست گوسفند یا بز بـرای نگهداری و حمل و نقل روغن یا دوغ.

**مەشـــکەژەن:** *maškažan* کەســـێ کـــە مەشکە دەژەنێ. مشک بهم زدن، کـسی که مشک را برای گرفتن کره از دوغ بـه طور متوالی تکان دهد.

**مەشکە ژەندن:** *maškažanden* ژاندنی مەشکە. مشك زدن.

**مەشکەو مەڵان:** *maškawmaĭân* بریتـە لـە سـینە و ران، مرۆڤـی قەڵـەو. اشـاره کنایەای به سینه و ران آدم چاق.

**مەشیا:** *mašyâ* دەبووایـا، وەکـو (مەشـیا بڕوایـت). مـیبایـست، ماننـد (مـیبایـست میرفتی).

**مەشـــیای:** *mašyâē* دەبـــووای، وەکـــو (مەشـیای بڕوایـت). مـیبایـست، ماننـد (میبایست میرفتی).

**مەشـــیایای:** *mašyâyâē* دەبـــووای، دەبووایا. میبایستی، میبایست میبود..

**مەعـدەخاووی:** *madaxâvi* دڵ چـوون. حالتی از بی حسی در معده.

**مـەعزەرەت:** *ma zarat* داوای لێبووردن. معذرت، عذرخواهی، پوزش.

**مـــــەعمور:** *mamur* راســـــپاردە، کاربەدەستی دەوڵەتی و فەرمانبـەر. مأمو، مـصدرکار، مـسئول انجـام دادن کـار، گمارده شده.

**مـــەغار:** *mayâr* ئەشـــکەوتی قـــووڵ، کەرەسەیەك لە کاری نەجاران و دارتاشان. غار عمیق، ابزاری برای کندن جـوب در نجاری.

**مـــەغریب:** *mayrib* کـاتی خۆرنـــشین، رۆژئاوا. غروب، جانب غرب.

**مەفرەق**: *mafraq* پێکەهاتەیەك لە مس و قلـع. مفـرق، آلیـاژی از قلـع و مـس در رنگهای مختلـف سـرخ، زرد، نـارنجی کـه در ریخته گری مورد استفاده است.

**مەقاش**: *maqâš* پەنگر، مقس. انبرک، گیره مخصوص گرفتن اخگر.

**مەقام**: *maqâm* مقام، پایـە، پلـە. رتبـه، مرتبه، شأن.

**مەکارە**: *makâra* قرقرەی دەزووی جـل دوورین. قرقره، شئ با دو سر گرد وار که نخ خیاطی را دور آن پیچیده اند.

**مەکر**: *maker* فێڵ، کەید. مکر، نیرنـگ، حیله، ریا

**مەکۆ**: *makō* ماکۆ، جێ. مکو بافنـدگی، جایگاه و محل چیزی.

**مەگـەر**: *magar* وشـەی پرسـیار، وەکـو (مەگـەر نـەڕویت). مگـر،ماننـد (مگـر نرفتی).

**مەگەز**: *magaz* مـێش. مگس، یکـی از انواع حشرات که دارای خرطوم، دو بال و دو شاخک است.

**مـەل**: *mal* پەلـەوەر، باڵنـدە. پرنــــده، بخشی عظـیم و متنــوع از مرغــان کــه عموماً دارای بال دو پا و منقار هستند.

**مــەڵا**: *maĺâ* مــەلا، زانــای ئــاینی. مــلا، آخوند، روحانی.

مــەڵات: *maĺât* قـوڕی نـێوان خـشت و بەرد لە کاری بەناییدا. مـایع مخلــوط از گل یا ماســه کــه در هنگــام ســاختمان سازی بین آجرها میریزند.

**مەڵاخوەر**: *maĺâxwar* ئـەو وشـەیە لـە زاری خەڵکیــدا بــە مانــای هــەرزانی و هەرزانبوونی شتێك بە کار دەبـرێ. کنایه از ارزانی، در اصطلاح مردم چیــزی کــه قیمت آن گران باشد می گویند مُلاخــور نشده یعنی ارزان نشده.

**مـلاز**: *maĺâz* کـەوان گـرتنی جانـەوەری راوکەر، خۆداگرتن بـۆ ڕاو. کمین، چــشم طمع، کمین حیوانات.

**مەڵاژك**: *maĺâžek* تەوقی سەری هێشتا نەگرساوی منـداڵ. بخشی از جمجمـه سـر کودك که هنوز محکم نشده، ملاج.

**مەڵاژن**: *maĺâžen* هاوسەری مـەڵا، ژنـی مەڵا. همسر ملا مکتب دار.

**مەڵاس**: *maĺâs* ملاز، خۆداگرتن بۆ راو. ملاز، کمین، چشم طمع.

**مەڵاشــك**: *maĺâšek* ئاسمانــەی دەمــی منداڵ. سقف دهان کودك.

**مەڵاشــك کـــەفتن**: *maĺâšekkaften* هاروی دەم کەوتن. سق افتادن بچه.

**مەلافـە**: *malâfa* پارچـەی تایبــەت بــە بــەرگگرتنی لـێف یـان پـەتوو (بــەتانی). ملحفه.

**مەلاقە**: *malâqa* کەوچوو یان کەوچکی گەورە. ملاقه، قاشــق بــزرگ دســته دار بلند و گود برای کشیدن غذا از دیگ.

**مەڵاك**: *maĺâk* چێژ، تـام. مــزە، طعــم، چشیدن.

**مەلایەکە**: *malâyaka* فریشته. ملائکه، ملایك، فرشتگان.

**مەلایەکەت**: *malâyakat* فریشتەگەل. ملائکه، فرشتگان.

**مـەلۆ**: *maĭō* باوەشـێك لـە گیـای دووراو، سەرجەمی چەند باقە گیا پێکەوە. تودەای از غله درو شده.

**مەلۆ سەر**: *maĭōsar* کەرەسەی تایبـەت بـە جـەم کردنــی مــەلۆ. ابــزاری کــه در کشاورزی سنتی بکار میرود.

**مەلووچك**: *maluček* چۆلەکە. گنجشك، پرندەای کوچك از دستەی سبکبالان.

**مـەلوول**: *malul* خـەمبار، کـز، خـەمین. افسرده، دل آزرده.

**مەلــە**: *mala* لــە ئــاودا یــاریکردن و نەخنکان. شـنا، شـنا کـردن در آب، یکـی از رشتەهای ورزشی آبی.

**مەلـــەك**: *malak* مـــەلیك، فریـــشتە. فرشتە، سلطان، دارای قــدرت و ســلطه، پادشاه.

**مەلەکە تاوس**: *malakatâws* لە ئـاینی ئیزەدی و پارسیدا یـەکێ لـە فریـشتەکانە. یکی از فرشتەهای آئین پارسیان و ایزدی.

**مەلەوان**: *malawân* کەسێ کە دەتـوانی لە ئاودا مەلە بکا. شناگر، کسی کـه حرفـه او شنا در آب باشد.

**مەلەوانی**: *malawâni* کاری مەلـەکردن لە ئاو، سـەربازی هـێزی دەلیـایی. ملـوانی، شناگری، سرباز نیروی دریایی

**مەڵهـەم**: *maĭham* مەڵحـەم. مـرهم، دارویی کـه بـرای تـرمیم زخـم یـا تـسکین درد بکار میرود، پماد.

**مەلیـــــچك**: *maliček* چــــــۆلەکە. گنجـشك،یکی از انـواع پرنـدگان کوچـك و دانه خوار از سبك بالان.

**مەلیس**: *malis* فیـسێندراوی قەیـسی لـە ئاودا. برگه خیسانده شده در آب.

**مەلیساو**: *malisâw* قەیسیی فیسێندراو. برگەی خیسانده شده زردآلو در آب.

**مــەلین**: *malin* ڕاکێـشان لەســەر زەوی وگرتنەوە لە یاریی هەلووکان دا. کشانیدن دست برای دست یافتن به چیزی درحالت خوابیده در بازی سنتی

**مەمکــە**: *mamka* مـــەمك. پـــستان، پستانك.

**مەمکــەخوەر**: *mamkaxwar* منـــداڵی شیرخۆر، مەمك خوەر. شیرخواره.

**مەمکەمــژ**: *mamkamež* مــەمك مــژ. پستانك.

**مەملەکـەت**: *mamlakat* وڵات. مملکـت، کشور.

**مــەمنوون**: *mamnun* سـپاس. ممنــون، متشکر، سپاسگزار.

**مەن**: *man* کێشانەیەك بەرانبەر بە سێ کیلـو. واحـد مــن در تــوزین معــادل ســه کیلوگرم

**مەنارە**: *manâra* ها، بڵندایی تایبەت بە بانگدان لە مزگەوتـدا. مناره، جــای نــور، گل دسته، ستون و ساختمان برج ماننــد در معابد و مساجد برای روشـــن کــردن چراغ و یا اذان گفتن.

**مەنجوق**: *manjuq* مووړووی زۆر ورد.

منجوق، دانەهای ریـز در رنگهای مختلف کـه برای تزئین از آن استفاده میکنند.

**مـــــەنزڵ**: *manzeĭ* خـــــانوو، جـــــێ حەسانەوە. منزل، خانە، سرا، جـای فـرود آمدن.

**مەنفەعەت**: *manfa at* قازانج. منفعت، فایده، سود، آنچه که موجب فایده و سـود گردد.

**مـەنگ**: *mang* مـەنگ، گـێژ، کـاس، وڕ. منگ، گنگ، گیج، کم هوش.

**مەنگەڵ**: *mangaĭ* مەنقەڵ، مەقەڵی. منقل، آتشدان، ظرفی کـه در آن آتـش درست میکنند.

**مەنگەڵی**: *mangaĭi* ئاماژەیە بۆ تلیاکی. کنایـه از تریـاکی، منـسوب بـه مـەنگول، منقلی.

**مەنگەنە**: *mangana* گیرە. منگنە.

**مـەنگی**: *mangi* مەنـدی، گـێژی، وڕی، کاسی. منگی، گنگی، گیجی، کم هوشی.

**مەنـەر**: *manar* لەرزوکـە، لەرزێـنەر، لەرینەوەی بە ئەسپایی. لرزان، جنبان.

**مەواجب**: *mawâjeb* مووچەی مانگانە. مـستمری، مواجـب، مقـرری ماهانـه یـا سالانه، مقرر کرده شدەها.

**مەوج**: *mawj* دەستکردێکە وەکو جاجیم کە تایبەتە بە پێچانەوەی پێخەف و شتی وا، مـەوجی دەسـتکردی سـنە زۆر بـە نـاو بانگە. جاجیم، یکی از صـنایع دسـتی و بافتنی از جنس پشم که از آن به عنـوان رختخـواب پـیچ یـا روکـش اسـتفاده می‌کنند، موج تولیدی سنندج از شهرت خاصی برخوردار است.

**مـەوزۆع**: *mawzō* چەمك، تم. موضوع، تِم.

**مەوقووفە**: *mawqufa* موڵکی وقفکراو. موقوفـه، وقـف شـده، ملکـی کـه درآمـد آن خـرج کارهـای عـام المنفعـەای کـه واقـف تعیین کرده برسد.

**مــــەولووی**: *mawlui* رەسمویاســــای تایبـــــەت بـــــە رۆژی لـــــەدایکبوونی پەیغەمبـەری ئیـسلام (ص) ،مولـــودی، مراسمی مذهبی در سالروز تولد پیـامبر اکرم(ص).

**مەوڵەق**: *mawaĭaq* ئـاوەژووبوون، بـێ دەنـگ مـان. بـی حـرکتی و سـاکت، مـات، متحیر، آویزان و پا در هوا و بلاتکلیف هم معنی میدهد.

**مەولەوی**: *mawlawi* نازنـاوی مامۆسـتا عەبـــدولڕەحیم تـــاوگۆزی شـــاعیری هەرەبـــەرزی شـــێعر کلاســیکی کــوردی شێوەزاری گۆران.

ها تەن ئـەلوەدای زیـندەگانیش کـەرد
قەدەم ڕەنجە کەر هام فەردە کەی فەرد
لا بەر تەختەی سەنگ ئەڵحەدسە رای ڕێش
جەم کەر گەرد خاك جەستەی خەستەی وێش
ئامێتەن وە یاد باڵای تورك تەڕ
یانێ نم ناکەن زوو مەبۆ وەهەڕ
درووس کەر نەو هەڕ شێوەی بوڵبوڵێ
بنیەش نە سەر شاخ گۆڵێ یا چڵێ
بەڵکم ئەو سەیاد جە ناکاو جارێ
بویەرۆ پەی گەشت کوشت شکارێ
نەچیرگای وێشەن وە پارێز کەم کەم

بەڵەدەن، مدیۆ، مەکەرۆش وە چەم
خەدەنگێ هەنی هەوا دەروە
پەرێ مەرگێوتەر ئیحیام کەرەوە
هەرساتێ سەدجار بەو تیر نەو تەرکەش
زیندەگی و مەردەن ئامان وەشەن وەش
(مەولەوی)

مولوی، لقب شاعر بزرگ ملاعبدالرحیم معدومی ۱۳۰۰-۱۳۲۱ ه.ق یکی از استوانه‌های رفیع شعر کلاسیک کُردی که به گویش اورامی یا گورانی شعر سروده برای کسب اطلاعات بیشتر به منابع ادبی مراجعه شود.

**مەویژ**: *mawiž* تری وشك کراو، مێوژ. مویز، انگور خشك شده.

**مەهەك**: *mahak* مەحەك، کەرەسەی بەردینی تاقیکردنەوەی زێر. محک، سنگی که طلا یا نقره را به آن می مالند.

**مەێ**: *maē* نەێ، وەکو (تۆ مەێ بۆ ئەێرە). نیا، مانند (تو به اینجا نیا).

**مەێ**: *maē* مەێ، بادە. می، بادە، نوشابه الکلی و سُکرآور، در اصطلاح عرفا معنی خاصی را القا می کند.

**مەیان**: *mayân* مەیدان، وەکو (مەیان فووتباڵ). میدان، مانند (میدان فوتبال).

**مەیت**: *mayet* تەرم، لاشەی مردوو، مێت. مرده، لاشه مرده، جنازه.

**مەیتەر**: *mayetar* خزمەتکاری ئەسپ. تیمارگر اسب، مهتر اسب.

**مەێخانە**: *maēxâna* مەیخانە. میخانه، جای مشروب، در اصطلاح عرفا و شعرا معنای خاصی را القا می کند.

**مەێ خوەر**: *maēxwar* شەراب خۆر. می خواره، باده‌خوار.

**مەێخوەش**: *maēxwaš* نێوان ترش و شیرین. ترش و شیرین، ملس.

**مەیل**: *mayel* ئارەزوو، تاسە، حەز. میل، اشتیاق، آرزو، اشتها.

**مەیلان**: *maylân* ئارەزوو، ئاوات، رای، ئیرادە. آرزوها، آمال، اراده.

**مەیموون**: *maymun* زیندەوەریکی جەنگەڵییە. میمون، از حیوانات جنگلی که انواع مختلف از آن وجود دارد.

**مەێ نۆش**: *maēnōš* مەی خۆر. می خواره، می نوش.

**مەێ نۆشی**: *maēnōši* مەی خوری، مەی خواردنەوە. می نوشی، میخوارەگی، باده نوشی، میگساری.

**مەێنەت**: *maēnat* ئەرك، زەحمەت، ڕەنج، بەڵا. محنت، بلا، آزار، اندوه.

**مەێنەتبار**: *maēnatbâr* ئەرکدار، خەمبار. محنت بار، پر از رنج و بلا.

**مەێنەتی**: *maēnati* خەمباری، پڕ ئەرکی. محنتی، درد و مشقت، رنج.

**مەیە**: *maya* ئیشتیا، مەیل، دڵ لە شتی بوون بۆ خواردن. اشتها، میل.

**میانە**: *miâna* ناونجی، دەمنەی نێوەڕاستی قلیان. میانه، لوله قلیان، نام شهری در آذربایجان.

**میتان**: *mitân* ئاماژەیە بۆ بچووکی خرتۆڵ. کوچولو، نازدادن بچه.

**میتۆڵ**: *mitōĭ* ئاماژەیە بۆ بچووکی خرتۆڵ. اصطلاحی برای نازدادن بچه.

**مـێحراو**: $m\bar{e}\hat{h}r\hat{a}w$ میحـراب. محـراب، جـای ایـستادن پیـشنماز در مـسجد بـرای ادای نماز جماعت در نماز پنجگانه.
**مێخ**: $m\bar{e}x$ بزمار. میخ، میله کوتاه فلزی برای اتصّال دو تکه تخته.
**مێخـچه**: $m\bar{e}x\check{c}a$ بزمـاره، خـاڵی ڕەق نێودەست و ژێر پێ. میخچه، میخ کوچك، ورمی سفت و سخت روی پوست و کف پا.
**میـداد**: $mid\hat{a}d$ جـۆرێ پـێنووسی نـووك زوغاڵی. مداد، از وسایل نوشتن که مغز آن بـا سـرب سـیاه ومـواد دیگـر در رنگهـای مختلـف سـاخته مـی‌شـود کـه بـا آن مـی نویسند.
**میــــداڵ**: $mid\hat{a}\breve{l}$ مــــەداڵ، خــــەلاتی ســـەربەرزی، نیـــشانەی شـــانازی. مــدال، نـشانه‌ی لیاقـت کـه بـر سـینه لبـاس مـی بندند.
**میر**: $mir$ میر، ئەمیر، سەرۆك، پاشا. امیر، سردار.
**میرات**: $mir\hat{a}t$ ماڵی بەجێماو لـە مـردوو. میراث، اموال بجا مانده از مُرده.
**میراتـــی**: $mir\hat{a}ti$ مـــاڵی بەجـــێماو لـــە مردوو. ارث به جامانده از مُرده.
**میراخـــۆر**: $mir\hat{a}x\bar{o}\acute{r}$ کەســـێك کـــە بەرپرســـایەتیی تەویلـــەی ئـــەمیران و پاشـاکانی لـە ئەسـتۆ بـووە. میرآخـــور، متصدی اصـطبل در دسـتگاه امیـران و حاکمان در قدیم.
**مـــیراو**: $mir\hat{a}w$ کەســـێ کـــە کـــاری دابەشکردنی ئاو لە زەمانی قەدیمدا بـووە. میراب، کسی که آب را به خانـه‌ها و باغها تقسیم می‌کرد.
**مـێردزمە**: $m\bar{e}rdezma$ جنۆکـە. شـبح، موجودی، خرافی.
**مـــیرزا**: $mirz\hat{a}$ مـــیرزا، ئـــەمیرزادە، خوێندەوار. میرزا، امیـــرزاده، بـــه معنـــی منشی نیز آمده و در اصطلاح قــدیم بــه اشخاص با سواد گفته می‌شد.
**میرغـــەزەب**: $mir\gamma azab$ میرخـــەزەب، جەلاو. میرغضب، جلاد، مأمور اعدام.
**مێرگ**: $m\bar{e}rg$ چیمەن، سەوزە. سبـزه، از گــیاهان خـودرو بـدون سـاقه و سوزنـــی شکل.
**مـــێرگزار**: $m\bar{e}rgz\hat{a}r$ چـــیمەن زار، گیاجار. سبزەزار، چمن زار.
**مـێز**: $m\bar{e}z$ مـێزی تایبـەت بـە کـاری خواردن یا خوێندن و نووسین. میـز، میـز تحریر، میزکار.
**مێز**: $m\bar{e}z$ گمێز. ادرار، پیشاب، شاش.
**میزان**: $miz\hat{a}n$ بەرانبـەر. میزان، برابـر، یکسان، طراز.
**مێزدان**: $m\bar{e}zd\hat{a}n$ گمێزدان. مثانه، یکی از اعضاء دستگاه دفع ادرار بدن.
**مێزڵدان**: $m\bar{e}z\breve{l}d\hat{a}n$ گمێزدان. مثانه.
**مـــێزن**: $m\bar{e}zen$ گمـــێزن. بـــسیار ادرار کننده.
**مـــێزەچورتکە**: $m\bar{e}za\check{c}ortka$ مـــێزە چۆرِکێ. چکمیزك.
**مێزەر**: $m\bar{e}zar$ سەرپێچ. نگاه مێزەره.
مـێزەرە: $m\bar{e}zara$ سەروپـێچ. عمامـــه مخصوص روحانیون و سادات که در میان

کُردها به ترتیب به رنگ سفید و سبز می‌باشد.

**مێش**: *mēš* گوێز لە یاریی منداڵاندا. تیله در بازی تیله بازی یا گردو بازی.

**مێشەسی**: *mēšasi* باڵندەیەکە، چێرك. هوبره، یکی از انواع پرندگان.

**مێکوت**: *mēkot* کوتەکی دارین، مێکوژ. چماق، چوب دستی سرگرد.

**مێڵ**: *mēĭ* ئامێرێکی وەرزشی لە زۆرخانە، ئامرازی سورمە کێشان. میل سرمه کشی، میل ورزشی در ورزش باستانی.

**مێڵە**: *mēĭa* مێڵ، لوول کراو. میله، قطعه‌ای فلزی طویل و باریک.

**مێمان**: *mēmân* مێوان، مەیمان، میوان. مهمان، کسی که به خانه کس دیگری می‌رود و از او پذیرایی کنند.

**مێمانخانە**: *mēmânxâna* هوتێل، مێوانخانە. مهمان‌خانه، مسافرخانه، هتل.

**مێماندار**: *mēmândâr* مێواندار، مەێماندار. مهماندار، کسی که میهمان دارد، پذیرایی کننده از میهمان.

**مێمانداری**: *mēmândâri* مێوانداری، مەێمانداری. مهمانداری، پذیرایی از میهمانان.

**مێمانکردن**: *mēmânkerden* مێوانکردن. مهمان کردن.

**مێمانی**: *mēmâni* مەێمانی، مێوانی. مهمانی، سور و سات.

**میمك**: *mimek* میم، پوور، خوشکی دایك یان باوك. خاله، عمه.

**میمکەزا**: *mimkazâ* پوورزا. فرزند خاله یا عمه.

**میمکەزاگ**: *mimkazâg* پوورزا، میمك زا. فرزند خاله یا عمه.

**مێمڵ**: *mēmeĭ* دژ، وەکو (گورگ مێمڵ پەزە). ضد، دشمن، مانند (گرگ دشمن گوسفند است).

**میمی**: *mimi* میم، پوور، خوشکی دایك یان باوك. خاله، عمه، خواهر پدر یا مادر به هر دو اتلاق می‌گردد.

**مێو**: *mēw* داری ترێ. درخت مو، تاک که محصول آن انگور است

**مێوە**: *mēwa* بەری دار و بیستان. میوه، از محصولات کشاورزی مورد مصرف انسان، ثمره ی درخت و بوته.

**مێوەژەڵ**: *mēwažaĭ* چڵی وشکەوەبووی داری مێو. شاخه‌ی هرس شده‌ی درخت تاك یا مو.

**مێوەگەنان**: *mēwaganân* مانگی رەزبەر. مهرماه، فصل تمام شدن میوه‌ها.

# ن

**نا**: *nâ* نه، نا، وەڵامی نه. نه، هرگز نه.

**نابـاب**: *nâbâb* نابـاو، نـاجۆر، نابـەدڵ. ناباب، نامتداول، نامناسب، ناجور.

**نابـار**: *nâbâr* بـێ قـەبارە، نـازەریف، ناپەسـەند. نازیبـا، زشـت، بـد شـكل، بـد قواره.

**نابەڵـەو**: *nâbaĭaw* نابەڵـەد، ناشـارەزا. نابلد، ناوارد.

**نابەڵـــەوی**: *nâbaĭawi* نابەڵـــەدی، ناشارەزایی. نابلدی، ناواردی.

**ناپارێزی**: *nâpârēzi* دووری نەكردن له مەترسـی، دوورەپەرێـزی نـەكردن. نـا پرهیزی.

**ناپاك**: *nâpâk* پیس. ناپاك، آلوده.

**ناپۆخـت**: *nâpōxt* نارێـك. نازیبـــا، نامنظم، ناپخته.

**ناپۆختـه**: *nâpōxta* نارێـك، كرچـوكاڵ، بێ ئەزموون. ناآزموده، ناپخته، خام.

**نـــاپۆختی**: *nâpōxti* نـــەپوخت، بـــێ ئەزموون. بی تجربگی، ناپختگی.

**ناپەسـەن**: *nâpasan* پەسـەند نـەكراو، نەبەدڵ. ناپسند، نامقبول.

**ناپیـــاگ**: *nâpiyâg* ناپیـــاو، دوور لـــه كردەوەی پیاوانه. نـامرد، بـەدور از مـنش مردانه.

**ناپیاگی**: *nâpiyâgi* ناپیاوی. نامردی.

**نـــات**: *nât* ناشـــتت، داتنـــا. نهـــــادی، گذاشتی، كاشتی.

**ناتاو**: *nâtâw* ناقولا، فێڵباز، نادروست. ناهنجار، نامناسب، نادرست.

**ناتـاوی**: *nâtâwi* نادروسـتی. نادرسـتی، اصطلاحی به معنای نارسایی.

**ناتواو**: *nâtwâw* ناتەواو، ناقز. ناتمـام، ناكامل، ناقص.

**ناتەمیس**: *nâtamis* پیس، دژی خاوێن. كثیف، ناپاک، نجس.

**ناجۆر**: *nâjōr* دژی رێكوپێك، ناپەسەند. ناجور، ناپسند.

**ناچێ**: *nâčē* نەوەك، نـاڕوا، وەكو (ئەمـه لەوە ناچێ). شبیه نیست، نمی رود، مانند (این شبیه آن نیست).

**ناحـــاڵی**: *nâĥâĭi* لاژگ، كـــەم ئـــاوەز. ناحالی، دیر فهم، كج فهم.

**ناحـــەز**: *nâĥaz* بـــێ مـــەیل، نابـــەدڵ. زشت، نازیبا، ناراضی، بی‌میل.

**ناحەزی**: *nâĥazi* بێ مەیلی. نارضـایی، بی میلی، بی‌علاقه‌گی.

**ناحەســـــاو**: *nâĥasâw* ناحەســـــێو، ناحه‌سیب. نامقبول، بدحساب.

**ناحەســـاوی**: *nâĥasâwi* ناحەســـێبی. نامقبول، ناراستی، بدحسابی.

**ناحـەق**: *nâĥaq* ناحـەق، زوڵـم. نـاحق، ناروا.

**نـــاخ**: *nâx* نـــاق، قـــووڵایی. ژرفـــا، درون، عمق.

**ناخافڵ**: *nâxâfeĭ* كتوپڕ، ناكاو. ناگهان.

**نـــاخوون**: *nâxun* نـــاخوو، ناخوێـــن، نینـــۆك. نـــاخن، اســـتخوان نـــازك روی انگشتان. نـاخن يـا كـه از جـنس اسـتخوان نازك است.

**ناخوونگیر**: *nâxungir* ئامێری تایبـەتی گرتن و بڕینی ناخون، نینۆکبڕ. ناخن گیر، وسیله‌ای که ناخن را کوتاه می‌کند.

**ناخوون وشك**: *nâxunwešk* رژد. ناخن خشك، كنايه از خسيس.

**ناخوونـەك**: *nâxunak* بـە بـێ ئیجـازە خواردن لە شتێ. ناخنك، اندکی از چیزی را بدون اجازه خوردن.

**ناخوونـــەگ**: *nâxunag* نەخۆشـییەکی چاو. يك نوع بيماری چشم.

**نـــاخوونی**: *nâxuni* پەنـــچە كێـــشی. ناخنی، آنچه را كه با ناخن حك كنند.

**نـــاخوەش**: *nâxwaš* ناســـاق، نـــاخۆش، ناساخ. بيمار، مريض، بدحال.

**ناخوەشی**: *nâxwaši* ناساخی، ناخۆشـی. بیماری، مرض.

**نـادرووس**: *nâderus* ناڕاسـت، تاوانبـار. نادرست، خطاكار.

**نادیـار**: *nâdiyâr* ون، بـێ سەروشـوێن، شـاراوە، بـزر. ناپیدا، گـم، مفقـود الاثـر، مخفی.

**نادیـــاری**: *nâdiyâri* بـــێ سەروشوێـــنی، شاراوەیی. ناپیدای، نامعلومی.

**ناڕاس**: *nâŕâs* ناڕاست، لار. کج، ناراست.

**ناڕاســـی**: *nâŕâis* ناڕاســـتی، نادروســـتی. نادرستی، ناراستی.

**ناردن**: *nârden* هەناردن، ڕەوانەکردن. ارسال كردن، فرستادن.

**ناردنـــەوە**: *nârdenawa* نـــاردنی دوا جـارەکی، سـەر لـە نـوێ نـاردن. بـاز پـس فرستادن.

**نـاردی**: *nârdi* رەوانـەی کـرد. فرسـتاد، آنرا فرستاد، ارسال داشت.

**نـــارنج**: *nârenj* نـــارنج. نارنـــــــج، از مركبات شبيه پرتقال با مزه ای تـرش و يكی از محصولات كشاورزی است كه در شمال ايران پرورش می‌يابد.

**نارنجــــــەك**: *nârenjak* نـــــارنجۆك. نارنجک، ترقه وسيله انفجاری دست ساز كه در عيد نوروز جوانـان بـا انفجـار آن شادی می آفريننـد، سـلاحی جنگـی و مخرب.

**نـارنجی**: *nârenji* ڕەنگـی وەکـو نـارنج. نارنجی، رنگ نارنجی.

**نـارنگی**: *nârengi* مێوەیەکە. نارنگـی، از مركبـات باغـی كه در شمـال ايـران پرورش می‌يابد.

**نارەون**: *nârwan* داری نـارەون. نـارون، درخت نـارون درختـی بـزرگ و پُـرشاخ و بـرگ.

**نارە**: *nâra* نەڕە. نعره، از اصوات.

**نارەتــە**: *nârata* نــەڕە، دەنگــی بــەرز. بانگ، غریو، گلبانگ.

**ناڕەحــەت**: *nâŕaĥat* تــووڕە، نــەخۆش، بێبـەش لـە ئاسـودەیی. ناراحـت، مـشوش، دردمند.

**نارەنار**: *nâranâr* دەنگی نـارە. زمزمـە، ترنم.

**ناریاگ**: *nâryâg* ناردراو. فرستاده شده، ارسال شده.

**ناز**: *nâz* عیّشوه، لەنجە. ناز، عشوه، خرام.

**نازا**: *nâzâ* نەزۆك. نازا، عقیم.

**نازار**: *nâzâr* نازدار، زۆر بە ناز. نازدار، بسیار عزیز.

**نازباڵش**: *nâzbâĭeš* باڵشت. ناز بالش، متکا، زیر سری مخصوص خواب

**ناز فرۆتن**: *nâzferōten* ناز فرۆشتن. ناز فروختن، عشوەگری کردن.

**نازککاری**: *nâzekkâri* نازك کاری، یەکی لە پیشە دەستییەکانی شاری سنەیە. نازک کاری، یکی از صنایع دستی روی چوب کە در سنندج از معروفیت خاصی برخوردار است، از محصولات مهم این صنعت تختە نردسازی است کە در نوع خود بی‌نظیر است از معروفترین استادان این صنعت مرحوم نعمتیان ومرحوم بهزادیان بودند.

**نازکەر**: *nâzkar* کەسێ کە عیشوە دەکا، زۆر بەناز. طناز، نازکننده.

**نازکێش**: *nâzkēš* خەمخوار، کەسێ کە نازی کەسێکی دیکە قبووڵ دەکا. غمخوار، نازکش، هم درد.

**نازکێشانن**: *nâzkēšânen* نازکێشانن. غمخواری کردن، ناز کشیدن.

**نازم**: *nâzem* یەکی لە سەر پەرشتانی قوتابخانە. ناظم، نظم دهنده، معاون مدرسه و مسئول دوم بعد از مدیر.

**نازونووز**: *nâzunuz* عیشوە و نازکردن. ناز و عشوه، غمزه و ناز.

**ناز و نیم ناز**: *nâzunimnâz* ناز و نووز، ناز و نیمە. ناز، غمزه.

**نازەریف**: *nâzarif* ناشیرین، ناحەز، ناپەسەند. نازیبا، نازشت، ناپسند، بدشکل.

**نازەنین**: *nâzanin* زۆر خۆشەویست، نێوێکە بۆ ئافرەتان. نازنین، عزیز، دوست داشتنی.

**نازین**: *nâzin* شانازیکردن. مباهات، فخر کردن، فخر.

**ناساق**: *nâsâq* ناساخ، ناخۆش. بیمار، مریض، ناسالم.

**ناساقی**: *nâsâqi* ناساخی، ناخۆشی. بیماری، ناسالمی.

**ناساندن**: *nâsânden* ناسران، پێ ناسین. شناسانیدن.

**ناسانن**: *nâsânen* ناساندن. شناختن، شناسانیدن.

**ناسریاگ**: *nâseryâg* ناسراو، ناستراو. شناخته شده.

**ناسك**: *nâsek* نازك، دژی کوڵفت، تەنك، نارین. نازك، شکننده.

**ناسکایی**: *nâsekâi(i)* ناسکی، تەنکی، نارینی. نازکی.

**ناسك پۆش**: *nâsekpōš* تەڕپۆش، ئەوەی کە جلی ناسك دەپۆشێ. نازك پوش، شیك پوش.

**ناسك دڵ**: *nâsekdeĭ* دڵ نازك، کەم دڵ. دل نازك، زود رنج.

**ناسـك كـارى**: *nâsekkâri* كـارى نـازك كارى. نازككارى، ريزەكارى.

**ناسكۆڵە**: *nâskōĭa* ناسكى چكۆلە. تـرد و شكننده، زيبا.

**ناسكە**: *nâseka* نازكـە، نـەرم و نيـان و تەنك، وەكو (ئەم كراسە ناسكە). نـازكى، نازك، لطيف، نـرم و زيبـا، ماننـد (ايـن پيراهن نازك است).

**ناسكى**: *nâseki* نازكى. نازكى، تردى.

**ناسـۆر**: *nâsōr* بـەترەف. زخـم التيـام نيافته.

**ناسياگ**: *nâsyâg* ناسراو. شناخته شده.

**ناســـين**: *nâsin* ناســاندن، ناســكردن. شناختن.

**ناســـينەوە**: *nâsinawa* ســـەرلەنوێ ناسين، ناساندنەوە. بازشناختن.

**ناشارەزا**: *nâšârazâ* نابەڵەد. ناآگاه، نـا وارد.

**ناشـتا**: *nâštâ* بـەر لـە خـواردنى نـانى بەيانى. ناشتا.

**ناشـــرين**: *nâšerin* ناپەســـەند، دژى شيرين. زشت، بد نما، نا زيبا، ناپسند.

**ناشوكر**: *nâšoker* ناسوپاس. ناسپاس، نا شكر، قدرناشناس.

**ناشى**: *nâši* ناشارەزا. ناوارد، ناشى.

**ناشــێ**: *nâšē* نـابێ، وا بـير ناكەمـەوە. غيرممكن است، فكـر نمـىكنم، نمـىبايـد، ميسر نيست.

**ناشـيرين**: *nâširin* دژى تـامى شـيرين. غيرشيرين و بـدمزه، زشـت روى نيـز معنـا مىدهد.

**ناشـــيرينى**: *nâširini* لــە جــوانى بــێ وەربوون. زشتى، نازيبايى.

**ناعەسڵ**: *nâ aseĭ* ناڕەسـەن. نـاجنس، بداصل، نانجيب، بدسگال.

**ناعـەلاج**: *nâ alâj* نـاعيلاج. ناچـار، غيرقابل علاج، لاعلاج، لابد.

**ناغـار**: *nâγâr* بـڕوا پـێنەكراو، گـەورە، عــەجايب، سەێــر، بەلاجــەوى. ناغــار، عجيب، باورنكردنى، بزرگ.

**نافـەك**: *nâfak* پـزووى شـواڵ. خـشتك، جاى بند تنبان.

**نافەكـە**: *nâfaka* بروانــە نافـەك. نگـاه نافەك.

**ناق**: *nâq* بن گـەروو. نـاخ گلـو، برقـسمت حنجره و بيخ گردن اتلاق مـىگـردد، بـيخ گلو.

**ناقابل**: *nâqâbel* كەم بايى، كەم بايـەخ. ناقابل، كم ارزش، كم بها.

**ناقــابلى**: *nâqâbeli* كــەم بايـــەخى. ناقابلى، بىعرضگى، كم ارزشى.

**ناقز**: *nâqez* ناقس، ناقيز، ناتەواو، كوچ، گۆج. ناقص، نارسا، ناتمام.

**نــاقۆڵا**: *nâqōĭâ* نابـار، نارێـك. نـاقولا، ناهنجار، بدقواره.

**ناكـا**: *nâkâ* ناكـاو، لـەپڕ. يهـو، ناگهـان، دربىخبرى.

**ناكـاو**: *nâkâw* لـە پـڕ، وەكـو (لـەناكاوا). ناگهان، كنايــە از زدن و از بــين بــردن، مانند (بطور ناگهانى).

**ناكۆك**: *nâkōk* ناساز، بێ كەيفبوون. پريشان حال، آشفته حال.

**ناکۆکی**: *nâkōki* ناکەیفی، ناسازی. بدحالی، کدورت، ناهنجاری.

**ناڵ**: *nâĭ* نەعل. نعل، قطعه فلزی که به پاشنه کفش یا سم اسب یا الاغ میزنند.

**نال**: *nâl* تاڵەکانی نێو قەڵەمی زەل. تارهای وسط قلم نی.

**ناڵان**: *nâĭân* لە حاڵی ناڵاندن. نالان، گریان، در حال ناله و فغان.

**ناڵاندن**: *nâĭânden* ناڵین. نالیدن، ناله کردن.

**ناڵانن**: *nâĭânen*ناڵاندن. نالیدن، در حال ناله و فغان.

**ناڵبەن**: *nâĭban* ناڵبەند. نعلبند، کسی که شغل او نعل کردن پای ستور است.

**ناڵچە**: *nâĭča* ناڵچەی کەوش، پاژنەی کەوش. نعلچەی کفش، پاشنەی کفش.

**ناڵچەگەر**: *nâĭčagar* ناڵ ساز. نعل ساز.

**ناڵدار**: *nâĭdâr* یەك سم. کنایه از ستور، نعلدار.

**ناڵە**: *nâĭa* دەنگی گریان. ناله، فغان.

**ناڵە ناڵ**: *nâĭanâĭ* دەنگی گریان. ناله کردن متوالی.

**نالی**: *nali* نازناوی مەلا خدر نالی یەکێ لە شاعیرە هەرە بەرزەکانی ئەدەبی کلاسیکی کوردی.

ئەسپی نەفەست دێت و دەچێ گەرمە عەنانی
ئەی مەستی ڕیازەت هەڵە هوشیاری جڵەوبە
وەك ماه و ستارەت كە ببێ مەیلی هەڵاتن
سەرکردەیی رۆژ رەهەڕەوی شەو، رەهزە نی خەو بە
(نالی) مەبە عاجز، كە ئەمە دەورە نەجەورە
ساقی کەرەمی یەك بە یەکە و نەوبە بە نەوبە
(نالی)

نالی، لقب یکی از بزرگترین شاعران ادب کلاسیك کُردی که سهم ارزندەای در نو آوری زبان و ادب کُردی داشته ملاخدر نالی در سال ۱۲۱۵ ه. ق متولد ودر سال ۱۲۹۰ ه.ق در استامبول فوت کرد.

**ناڵین**: *nâĭin* ها، ناڵاندن. نالیدن، فغان کردن.

**نام**: *nâm* نیام، ناومە. نهادم، گذاشتم، کاشتم.

**ناماقووڵ**: *nâmâquĭ* مرۆڤی بێ قەدر. بی تربیت، بیادب، نانجیب، نامعقول.

**نامزەد**: *nâmzad* دەزگیران. نامزد، نسبت دختر و پسر قبل از اجرای مراسم عروسی و نکاح.

**نامۆ** : *nâmō* بیانە، بیانی. بیگانە، غریب.

**ناموارەك**: *nâmewârak*ناموبارەك. بدشگون، بدیمن، نامیمون، نامبارك.

**نامووس**: *nâmus* شەرەف، ئابڕوو. شرف، عصمت، راز و سر.

**نامە**: *nâma* نووسراوەی ناردراو. نامە، نوشته، کاغذ نوشته، مکتوب ارسالی.

**نامەبەر**: *nâmabar* تەتەر، پۆستچی. نامەرسان، پُستچی.

**نامەت**: *nâmat* نەهامەت، نگبەتی. نکبت، بد یمن و نحس.

**نامەتی**: *nâmati* نامەوی، نەهامەتی. نکبتی، مصیبت باری، خواری، ذلت.

**نامەحرەم:** *nâmaȟram* دژی مەحرەم. نامحرم، بیگانه، زن یا مردی که محرم هم نباشند، کسی که به او اعتماد نتوان کرد.

**نامـــەرد:** *nâmard* نـــامرۆڤ، دوور لـــە مرۆڤایــەتی. نــامرد، نــاکس، بــی غــیرت، ترسو، خائن.

**نامــــەردی:** *nâmardi* نامرۆڤایـــەتی. نامردی، ناکسی، پستی و فرومایگی.

**نامەو:** *nâmaw* نەهامەت. بد بیار، بد شانس، سیه روز.

**نــان:** *nân* هــا، پــێخۆری یەومیــە، نــران. نان، نهادن، کاشتن.

**نــان بــدێ:** *nânbedē* بەخــشینەر. نــان بده، بخشنده، کریم، سخی.

**نـان بـڕین:** *nânbeŕin* بـڕینی مـەعاش. کنایه از قطع کردن درآمد کسی.

**نـــان تـــەنووری:** *nântanuri* نـــانی دروستکراو لە تەندووردا. نان تنوری.

**نان تیری:** *nânteri* چەشنێ نـانی مـاڵی. نــانی کــه روی ســاج بپزنــد و نــسبت بــه نانهای مشابه دارای دوام بیشتری است.

**نانخۆر:** *nânxōr* نان خـۆر، ئاماژەیـە بـۆ خاوخێزانی پیاو. نان خـور، کنایـه از اهل و عیـال کـه مـرد هزینـه‌ی تـأمین زنـدگی آنها را به عهده دارد.

**نـــــان خوەریـــــــشت:** *nânxwarešt* قەناعـەتکردن، پێخـوری کـەم. کنایـــه از قناعت کردن، طعام اندک.

**نانـدان:** *nândân* تەعامـدان. غذا دادن، طعام بخشیدن.

**نانـدەر:** *nândar* نـان بـدە، بەخشێنەر. بخشنده، سخی، نان بده.

**نان ساجی:** *nânsâji* چەشنێ نانی ماڵی. نان ساجی، نـوعی نـان لـواش کــه بـر روی ســاج پهــن مـــی‌کننــد و در تنـــور آن را می‌پزند.

**نــان ســەنگەکی:** *nânsangaki* جـۆرێ نان کە لە تەنـدووری لەسـەر ڕێـخ (چەو) دروست دەبێ. نان سنگک، یکی از اقسام نان که دارای فیبر غذایی بیشتر از سایر نانها ست.

**نانکردن:** *nânkerden* نان دروستکردن. نان پختن.

**نانکەر:** *nânkar* نانەوا. نان پز، نانوا.

**نان لەواش:** *nânlawâš* جۆرێ نان وەکو شاتە. نان لواش، یکی از اقسام نانها.

**نان مـاڵی:** *nânmâĭi* ئـەو نانـەی کـە لـە ماڵدا دەپێژن. نان خانگی.

**نان وشـکی:** *nânweški* تـەنیا نـان. نـان خالی، نان خشك و خالی.

**نان و ئاو:** *nânu âw* ئاونان. نان و آب.

**نانەجیب:** *nânajib* ناڕەسەن، بێ ئاکار. نانجیب، بداصل.

**نانـەڕەق:** *nânaŕaq* وردەنـانی وشـك و ڕەق. خرده نان، نان خشك.

**نانە ڕەقە:** *nânaŕaqa* وردەنـانی وشـك و ڕەق. خرده نان، نان خشك.

**نانەشـان:** *nânašân* چەشـنی سـەبەتەی پان چنراو لە تووڵی دارە بێ سەلە. سبــد طبقی چوبــی، صافی چوبــی که با دست

از ترکه‌های نـازک درخـت بیـد بافتـه می‌شود.

**نانه‌لەم**: *nânalam* نانەزك. کارگر، مزد بگیر با غذا.

**نانـەوا**: *nânawâ* نانکـەر، ئـەو کەسـەی کە پیشەی نان کردنە. نانوا، خباز.

**نـــاو**: *nâw* تــۆ، لا، دەروون. درون، تــو، میان.

**نـاو**: *nâw* نـێو، وەکـو (نـاو ئەوگوڵـە چـەس). اسـم، نـام، ماننـد (اسـم آن گـل چیست ؟).

**نـاو**: *nâw* حـەریم، باژێــڕ. محوطـــــە، منطقە، حریم.

**ناو**: *nâw* دەفری گەورەی تایبەت بە ئـاو خـواردنی ئـاژەڵ، قـوم، کـۆل. آبـــشخور، ظرف مخصوص مـستطیل شـکل بـرای حیوانات جهت آشامیدن آب.

**ناوبار**: *nâwbâr* نێوان بار. میانــه بــار، اضافه بار.

**ناو بردن**: *nâwberden* نێو بـردن. نـام بردن، اسم بردن، غیبت کردن.

**ناوبریـــــاگ**: *nâwberyâg* نـــــاوبراو. نامبرده شده، نامزد شده.

**ناوبەناو**: *nâwbanâw* جار بە جار. گاه گاه، وقت به وقت.

**ناوبــەین**: *nâwbayn* مابـەین. میـــان، میانه، وسط.

**ناوپـــا**: *nâwpâ* ناوگــەڵ. میـــان دوپـــا، شرمگاه.

**ناوپارە**: *nâwpâra* نـێوان، نـێوە راسـت، ئاماژەیــە بــۆ خـــانوو و بەرەیــەکی بــە قیمـەت. وسط شلوغی، میانــه، کنایــه از مرغوب بودن منزل یا محل.

**نـاوپڕ**: *nâwpeŕ* هـا، نێـو پـڕ. تـو پُـر، مغزدار.

**ناوت**: *nâwet* نێوی تۆ. نامت، نام تو.

**ناوتاق**: *nâwtâq* نێو تاق. میانه تاق.

**ناوتاوەیی**: *nâwtâwai(i)* ئەوەی کە لە نێو تاوەدا سووری دەکەنەوە. شامی کباب و هر چه که در تابه سرخ گردد.

**ناوجێ**: *nâwjē* ناوبژی. میانجی، بستر.

**ناوجێکـــــەر**: *nâwjēkar* ناوبژیکـــــەر. میانجی کننده، میانجی.

**ناوچاو**: *nâwčâw* نێو چاو. میان چشم، درون چشم.

**ناوچـاو پـاك**: *nâwčâwpâk* کەسـێ بـە ئیمـان و خـاون دڵ بـێ. معـــصوم، پـــاک، نورانی.

**ناوچاو تاریك**: *nâwčâwtârik* ڕووگرژ. اخمو، ترشرویی، بد یمن.

**ناوچـاو تـورش**: *nâwčâwtorš* کەسـی ترش ڕوو، گرژ و مۆن. ترشروی، اخمو.

**ناو چاو تورشیاگ**: *nâwčâwtoršiyâg* ناوچاو ترشاو. ترشروی، اخمو.

**ناوچـــــاوەکان**: *nâwčâwakân* نـــــێو چاوەکان. میان چشمها، اصـطلاحی دال بر رضایت و احترام جهــت تقبــل انجــام کاری.

**ناوچن**: *nâwčen* نـێواخن. پُــر کــردن وسط دیوار.

**ناوخـــاڵی**: *nâwaâĭi* پووچـــەڵ. پـــوك، توخالی.
**نـاو خـوا**: *nâwxwâ* نـێوی خـودا. نـام خدا، اسم خداوند.
**نــاودار**: *nâwdâr* بــەناوبانگ. نامــدار، مشهور، نامی.
**نـاوڕاس**: *nâwŕâs* نـێوان. وسط، میــان، مرکز.
**نـــاوڕان**: *nâwŕân* نـــاولنگ، گـــەڵ، لـــە ناوەراستی مێگلە. وسط لنگ، وسط دو پا، در میانه گله.
**نـــــــاوزڕان**: *nâwzeŕân* ناوبـــــــانگ دەرکـــردوو، ریـــسوا بـــوون. رســـوا شـــدن، معروف شده.
**نـــاو زڕیـــاگ**: *nâwzeŕyâg* ناوبـــانگ دەرکردوو بە خراپی. رسوا شده، مشهور خاص و عام.
**ناوسك**: *nâwsek* ناوزگ. درون شکم.
**نـاو شـار**: *nâwšâr* نـێوان شـار. وســـط شهر، داخل شهر، مرکز شهر.
**ناوشـان**: *nâwšân* نێـوان شـان. میانــه کتف.
**ناوك**: *nâwk* ها، نافك. ناف، مرکز اصلی اندام انسان و محل اتــصال بــه دســتگاه گوارشی مادر و جنین برای تغذیه.
**ناوك بڕین**: *nâwekbeŕin* بڕینی نـاوك لەکاتی بە دونیا هاتنی منداڵ. ناف بریدن در زمان تولد نوزاد.
**ناوك کەفتن**: *nâwekkaften* ناوك کەوتن. ناف افتادن، اصطلاحی برای نوعی بیماری کـه بیحـالی و ســـستی از علائم آن است.
**ناوك گـرتن**: *nâwekgerten* ها. نـاف گرفتن، اصـطلاحی بـرای عـلاج نـوعی بیماری که بیحالی و ســستی از عــوارض آن است.
**ناوکـە خوەشـە**: *nâwekaxwaša* هـا. هسته خوردنی، مانند هسته زردآلو.
**ناوگەڵ**: *nâwgaĭ* ناولنگ، نـاوڕان. وسط رانها و محدود شرمگاه.
**ناوگەل**: *nâwgal* ناوان، ناوەکان. اسامی، نامها.
**نـــاوگین**: *nâwgin* مـــام نـــاونجی، نێوەڕاست. وسطی، میانی.
**ناو لنگ**: *nâwleng* ناوگەڵ. میانه پاها.
**ناولەپ**: *nâwlap* ناودەست. کف دست.
**ناومـاڵ**: *nâwmâĭ* نـاوژوور، کەلوپـەلی ماڵ. درون خانه، اثاثیه خانه.
**ناو نووسی**: *nâwnusi* نێو نووسی. نام نویسی.
**ناونیـان**: *nâwniyân* ناونـان، رەســمەوە یاسای ناونـان. نـام گذاشـتن، مراســم نامگذاری، اسم گذاشتن.
**ناونیـــشان**: *nâwnišân* جـــێگاوشوێن. آدرس، نشانی.
**ناونیتکـە**: *nâwnitka* ناوسـووکایەتی، نازنـاوی خـراپ نـان. نـام و نـنگ، تهمـت ناروا.
**ناونیشان**: *nâwnišân* نێو و نیشانێ کە پێ دەناسریت. نام و نشان.

**ناوە**: *nâwa* دەفری تایبەتی قوڕکێشان. ناوەی گل کشی.

**ناوەخـت**: *nâwaxt* بـێ وەخـت، کـاتی ناکاو. بی هنگام، نابهنگام.

**ناوەکـان**: *nâwakân* ناوگـەل. اسـامی، نامها.

**ناوەکـێش**: *nâwakēš* کرێـکاری ناوەکێش. ناوە کش، کارگر ساختمانی که کارش حمل و نقل ظرف مخصوص خـاک و گل باشد.

**نـاوین**: *nâwin* سـواخدان. مالیـدن گـل روی دیوار و پشت بام، سایاندن، ساییدن.

**ناوینـەوە**: *nâwinawa* سـواخ دان. نگـاە ناوین.

**ناهـاڵ**: *nâhâĭ* چـەتوون. بـازیگوش، نـا اهل.

**ناهمێ**: *nâhmē* هەژار. بیچارە، نااميد.

**ناهەق**: *nâhaq* ناڕەوا. ناحق، ناروا.

**ناهـەقی**: *nâhaqi* نـاڕەوایی. حـق کـشی، ناروایی، ناحقی.

**نخۆ**: *nexō* کێشێکی وردە. نخود، واحـد وزن ۲۴ نخود برابـر یـک مثقـال برابـر ۰/۱۹۵۳ گرم.

**نخوەشەر**: *nexwašar* لەتکە نـۆك. لپە، نوعی از حبوبات که مصرف غذایی دارد.

**نخۆیك**: *nexōyek* یەك نخۆ. یک نخود، ۲۴ نخود یک مثقال برابر۰/۱۹۵۳گرم.

**نرخ**: *nerx* بایی. نـرخ، بها، قیمت.

**نرخ بڕین**: *nerxbeŕin* نرخدانان. نرخ گذاری کردن.

**نرکـانن**: *nerkânen* نرکانـدن. غریـدن، نعره زدن.

**نرکـە**: *nerka* نـەعرە، لـە دەنگـەکان. نعره، غره، از اصوات.

**نریـاگ**: *neryâg* نـاردراو، نـێردراو، ناردراو. فرستاده شده، ارسال شده.

**نریاگ**: *neryâg* دانراو، نراو. نهاده شده، کاشته شده، دفن شده.

**نزا**: *nezâ* پاڕانەوە، دوعا. دعا، نیایش.

**نزگـەرە**: *nezgara* نزگـرە. سکـسکه، واکنش معده بر اثر خوردن یا آشـامیدن با شتاب و عدم جذب معده.

**نزم**: *nezm* دژی بڵیند، دژی بوڵەند. کـم ارتفاع.

**نزمـایی**: *nezmâi(i)* نزمـان، دژی بلەندی. کم ارتفاعی.

**نزمـەوبووگ**: *nezmawbug* نزمـەوکراو. کوتاه شده، نزدیک شدن از بالا به طرف پایین.

**نزمـی**: *nezmi* پێـچەوانەی بڵینـدی. کـم ارتفاعی.

**نزوولە**: *nezula* دوعـای هەناسەساردی. آه سرد، آه و ناله و استغاثه.

**نزیـك**: *nezik* نزدیـك، نـەزدیك. نزدیـك، همجوار.

**نزیکـان**: *nezikân* نزدیکان، نـەزدیکان. نزدیك، نزدیکی ها.

**نزیکبـوون**: *nerzikbun* نزدیـك بـوون. نزدیك بودن، همجوار بودن.

**نزیکبوونـەوە**: *nezikbunawa* نزدیـك بوونەوە. نزدیك شدن.

**نزیـك خـستنەوە**: *nezikxestenawa* نزدیك خستنەوە. آوردن، نزدیك آوردن.

**نزیکـەی**: *nezikay* نـەزدیك بـە، نزیـك بە، وەکو (نزیکەی هـەزار تمـەن). نزدیـك، نزدیکـــی، حـــدود، ماننـــد (حـــدود هزارتومان).

**نزیکـــی**: *neziki* نـــەزدیك، نزدیکـــی. نزدیکی، همجواری.

**نژی وەرد**: *nežiward* گوڵێکی بەهارییە کە لە کوێستان دەڕوێ. گلـی خودرو بـه رنگ بنفـش با ساقـه ای نسبتاً ضخیم و پیـازدار کـه گلبرگهـای آن سـوزنی و چهارپر و متراکم است برگهایـی شبیـه برگ‌هـای گُل لالـه دارد بسیار خوشـبو است و در کوهستان می‌روید.

**نسار**: *nesâr* شوێنیك کە سێبەرە. جای همیشه سایه، سایه سار.

**نـسرم**: *neserm* نـزار، وەکـو (ئـەم ماڵـە نسرمە). سایه سار،ماننـد (ایـن خانـه در سایه‌سار است).

**نـسفەت**: *nesfat* نـێوان دووکـەس یـان شت. نسبت، خویشی و قرابـت، ارتبـاط بین دو چیز.

**نـسك**: *nesk* هـەژار، نـاهەمێ. فقـیر، گـدا، محتاج.

**نسك و ناهەمێ**: *neskunâhamē* هەژار، نەدار. مصیبت زده و بیچاره، بی چیز.

**نـسکە**: *neska* دەنگـی گریـان، پرمـە. صدای گریه، هق هق گریه.

**نسکە نسك**: *neskanesk* پرمە پرم. هق هق گریه.

**نـسیو**: *nesiw* بـەش، قـسمەت. نـصیب، قسمت، سهم.

**نـشاسە**: *nešâsa* نیـشاستە. نـــشاسته، ماده موجود در گندم، سیب زمینی، برنج و ذرت که مصرف غذایی دارد.

**نشتەر**: *neštar* نیـشتەر. نـشتر، آلـت رگ زدن و باز کردن دمل چرکین.

**نشس**: *nešas* نشتران، وەکو (ئـەو دیـوارە نشـــسی کردگـــە). نشـــست، فرورفتگـــی، مانند(آن دیوار فرورفتگی دارد).

**نشیمەن**: *nešiman* جێگای دانیشتن. جای نشستن، تهیگاه.

**نشیمەنگا**: *nešimangâ* جێگای نیشتن. محل نشستن، تهیگاه.

**نقاندن**: *neqânden* دەنگ دەرهێنان لە گەروو بە هـۆی زۆر هـێنان. زور زدن، نـق زدن.

**نقانن**: *neqânen* نقاندن. زور زدن، نـق زدن.

**نقن**: *neqen* کەسێ کە زۆر نق لێ دەدا. زور زن، نق نقو.

**نکانـــدن**: *nekânden* ناڵانـــدنی ســـۆك. نالیدن خفیف.

**نکـــانن**: *nekânen* ناڵانـــــدنی ســـــۆك، نکاندن. نگاه نکاندن.

**نکونـــــــاڵ**: *nekunâĭ* نکوناڵـــــــــە، هەناسەساردی. ناله های آهسته، آه و ناله.

**نکە**: *neka* نووکە، نق، ناڵە. نق زدن، نق، ناله درد آلوده.

**نکەنك**: *nekanek* ها، نووکە نـووك. نـق نق، ناله‌های دردآلود.

**نگابـان**: *negâbân* قـەراوڵ، پارێـزەر. نگهبان، محافظ.

**نگابـــانی**: *negâbâni* پارێـــزەری. نگهبانی، محافظت.

**نگـادار**: *negâdâr* نگـادار، پارێـزەر. نگهدار، نگهبان، محافظ، حافظ.

**نگـــاداری**: *negâdâri* پارێـــزگاری. محافظت.

**نگـاری**: *negâri* ئـامێری تایبـەت بـە کێشانی مادەیـەکی سـڕکەر لـە قەدیمـدا. نگاری، ابـزاری بـرای مـصرف مـادەای مخدردرقدیم.

**نگاهێشتن**: *negâhēšten* ئاگا لێ بـوون. نگهداری کردن، محافظت کردن.

**نگـــریس**: *negris* مرۆڤـــی پـــیس و چلکاوی، رژد. خسیس، بسیارکثیف.

**نم**: *nem* تەڕایی، شوێنی دزەکردنـی ئـاو. نم، اثر آب.

**نماو**: *nemâw* تەڕایی، شوێنی دزەکردنی ئاو. نشانه نم زدگی.

**نمـاویی**: *nemâwi(i)* تـەڕایی. نمـدار، نمناکی.

**نمایـشت**: *nemâyešt* پیـشاندان، شـانۆ. نمایش، به معرض دید قرار دادن.

**نمـــره**: *nemra* ژمـــاره بـــۆ ئـــەزموونی دەرس. نمره.

**نم نم**: *nemnem* نم نم، نمه نمه. نم نم، نم نمک.

**نمـەك بـە حـەرام**: *nemakbaĥarâm* بێ ئەمەك، ناسپاس، سپله. نمك به حـرام، قدرناشناس، نمك نشناس.

**نمنـاکی**: *nemnâki* شـێداری، نمـداری. نمناکی، نموری.

**نۆ**: *nō* یەك و هەشت، ۹. عدد نه.

**نواڵـە**: *nwâĭa* نەواڵـە. نوالـــە، گلولـــە خمیری که مخلوطی از آرد گندم بـا آب است، لقمه و توشه و مقداری از خـوراک نیز گفته می‌شود.

**نۆبسڵمان**: *nōbeseĭmân* تازە بـسڵومان بـوو. نـو مـسلمان، تـازه بـه دیـن اسـلام مشرف شده.

**نۆبەخش**: *nōbaxš* بەخشین بـۆ جاری ئەوەڵ. بخشیدن گناه بـرای اولـین بـار، صرف نظر کـردن از خطـای سـرزده در اولین بار.

**نۆجـەژن**: *nōjažn* هـەوڵین جیـژن دوای مەرگی ئازیزێك. اولیــن عیــد از تــاریخ مرگ عزیزان که در اعیاد قربان و رمضان برگزار می‌شود.

**نوخاڵـە**: *noxâla* زبـروزرەنگ. نخالـه، زرنگ، کلاش و حقه‌باز.

**نوختە**: *noxta* خاڵ، نوکتە. نقطه، خال.

**نوخـسان**: *noxsân* نوقـسان. نقـــصان، کاستی، کمبود.

**نۆخشە**: *nōxša* نۆبەرەی دەخڵ و مێوە. محصول تازه، تولید تازه، نوبر.

**نـــووزانن**: *nuzânen* نووزانـــدن. نگـــاه نووزه.

**نـۆش**: *nōš* هـا، ئـاوی خـۆش لـە گیـان. گوارا، نوش.

**نۆشاتر**: *nōšâter* کانزایەکی سپی و زۆر تێژە. نوشادر، جسمی جامد، بی بو و بـی

رنگ که در طب و صنعت مورد استفاده است.

**نۆشانن:** *nōšânen* نۆشاندن. نوشانیدن.

**نۆشای:** *nōšây* نۆشی کرد. نوشید، آنرا نوشید.

**نۆشکردن:** *nōškerden* نۆشین، خواردنی تراو. نوشیدن.

**نۆشین:** *nōšin* نۆشکردن. نوشیدن، نوشین.

**نۆقره:** *nōqra* زیو، زێو. نقره، قطعه‌ای گداخته شده از زرو سیم که فلزی است سفید رنگ و براق.

**نۆقسان:** *nōqsân* که‌می، له‌نگی. نقص، کاستی.

**نوقڵ:** *noqeĭ* یه‌کێ له شیرینی گه‌ل. نقل، یکی انواع شیرینی‌جات سنتی که معمولاً در مراسم شادی مصرف می شود.

**نۆقڵانه:** *nōqeĭâna* مزگێنی. شیرینی مژده دادن.

**نوقم:** *noqem* نوغر، ون، نوقم، ون بوون له ژێر ئاو. غرق، ناپیدا، خارج از دید.

**نوقمبوون:** *noqembun* نوغم بوون. غرق شدن، گم شدن.

**نوقمکریاگ:** *noqemkeryâg* نوقمکراو، نوغرکراو. غرق شده، گم شده.

**نوقمه‌سار:** *noqemasâr* بێ سه‌روشوێن. نگون سار، سرنگون.

**نوقوچگ:** *noqočeg* نقورچ، نوقرچك. نیشگون.

**نوقورچك:** *noqorček* نوقوچك. نیشگون.

**نۆك:** *nōk* نخۆ. نخود، یکی از انواع حبوبات که مصرف غذایی زیادی دارد.

**نوکته:** *nokta* مه‌ته‌ڵ، خاڵ. جوک، مثل، حرف زیبا، نقطه.

**نوکته‌باز:** *noktabâz* مه‌ته‌ڵباز. شوخ، زیباگوی.

**نۆکه چه‌رمگ:** *nōkačarmeg* نخۆسپی. نخود سفید، یکی از انواع نخود که مصرف غذایی زیادی دارد.

**نۆکه حۆله:** *nōkaĥōla* نخۆی سه‌وز. نخود تازه سبز با پوست.

**نۆکه‌ر:** *nōkar* پیاوی خزمه تکاری ماڵ. نوکر، کارگر خانه.

**نۆکه ڕه‌شه:** *nōkaŕaša* نخۆی ڕه‌ش. نخود سیاه.

**نۆکه‌ری:** *nōkari* کاری نۆکه‌ری. نوکری، چاکری.

**نۆکه قه‌نی:** *nōkaqani* نۆکی سپی که به‌کاری برژنـدان دێ. نخود قندی، نخودچی، یکی از انواع خشکبار و تنقلات.

**نۆگه:** *nōga* نۆبه، نۆره. نوبت.

**نۆگه بڕگێ:** *nōgabeŕgē* نۆبه بڕێ. نوبت بریدن از کسی برای رسیدن به مقصود خارج از اخلاق اجتماعی.

**نۆگه گردن:** *nōgagerden* نۆبه گردن. نوبت گرفتن.

**نۆڵ:** *nōĭ* نه‌رم، نیان، شل، وه‌کو (نرم و نۆڵ). نرم، مانند (نرم و شُل).

**نۆما:** *nōmâ* ئه‌سپی دوو ساڵان. کره اسب دوساله.

**نۆمـاڵ**: *nōmâĭ* تـازە مـاڵ پـێکەوە نـاو. تازە تأهل گزیدە و تشکیل خانە و زنـدگی دادە.

**نـــووچ**: *nuč* ســـەرخەو. چُـــرت، کمـــی استراحت.

**نـووزە**: *nuza* دەنگـی گریـانی ئـارام لـە سەرخۆ، لە دەنگەکان. صدای گریــە آرام، از اصوات.

**نـووزە نـووز**: *nuzanuz* دەنگـی پـەیتا پـەیتای نـووزە. صدای پیاپی گریــە آرام، صدای متوالی گریە.

**نووســـــریاگ**: *nuseryâg* نووســـــراوە. نوشتە شدە، مکتوب شدە.

**نووســەر**: *nusar* کەســێ کــە دەنووســێ. نویسندە، کاتب.

**نووســیاگ**: *nusyâg* نووســراو. نوشــتە شدە.

**نووسین**: *nusin* کـاری نووسـین. نوشـتن، کتابت.

**نووك**: *nuk* سەری تیژی هەرشـتێ. نـوك، منقار، انتهای بلندی.

**نووکن**: *nuken* کەسێ کـە نکوناڵە دەکا. کنایە از کسی کە زیاد آە و نالە میکند.

**نووکە نووك**: *nukanuk* دەنگی نکوناڵە. صدای آە و نالە متوالی.

**نوون**: *nun* ن، یەکێ لـە پیتـەکان. حـرف (ن)، از حروف الفبا.

**نوهـۆم**: *nohōm* نۆهـەم، هەشـت + یـەك ژمارەی ٩ ژوور. نهمین، اشکوبە.

**نوێـژ**: *nwēž* نوێـژ، یـەکی لـە ڕێوشـوێنە ئاینییــەکانی ئیـسلام بـۆ موسـلمانان کــە دەبێ بەجێ بێنن. نماز، یکــی از فــرایض دینی مسلمانان.

**نوێـژخوێن**: *nwēžxwēn* کەسـێ کـە لـە حاڵی نوێژدایە. نماز خوان، نمازگذار.

**نوێـژی**: *nwēži* پـاك و خاوێـن بـۆ نوێـژ کردن. نمازی، پاک، مطهر.

**نوێـن**: *nwēn* گـای مـێ سـێ سـاڵان. مـادە گاو سە سالە.

**نەبڕ**: *nabeŕ* نـەوڕ، چەشـنێ بـنی قـایم، نەپس. کند، نوعی طناب مقاوم.

**نەبوون**: *nabun* نـەداری، دژی هـەبوون. نداری، نیستی، نبودن.

**نەبوونی**: *nabuni* نەداری. نداری، فقر.

**نەبەتـــەر**: *nabatar* ئـــەژداد، بـــاوان. اجداد، نیاکان.

**نەبەز**: *nabaz* کۆڵنەدەر، توانـا و دڵاوەر، نەبەزراو. شکست ناپذیر.

**نـــەپۆخت**: *napōxt* هـــا، کـــاڵ، بـــێ ئەزموون. ناپختە، بدون تجربە، خام.

**نەپۆختە**: *napōxta* کاڵ، بێ ئـەزموون. نا پختە، خام.

**نەتاشـــــیاگ**: *natâšyâg* نەتاشـــــراو. نتراشیدە شدە.

**نەتانین**: *natânin* دژی توانین یا تانین. نتوانستن.

**نـــەترس**: *naters* بوێـــر، ئـــازا. نـــترس، جسور، با شهامت.

**نەتەوە**: *natawa* ها ڕەگەز، ملەت. نژاد، نسل، ملت.

**نەجابـــەت**: *najâbat* ڕەســــەنایەتی. نجابت، اصالت خانوادگی.

**نـەجات:** *najât* خـەلاس کـردن. نجـات، رهانیدن.

**نەجار:** *najâr* چیۆتاش. نجار، درودگر.

**نەجاو:** *najâw* نەجاویان. نجویده.

**نـــــەجاویاگ:** *najâwyâg* نـــــەجاواو، نەجووتراو، نەجووراوە. نجویده شده.

**نـــەجۆڕیاگ:** *najōŕyâg* نـــەجۆڕدراو. فصیح سخن گفتن، سخن گفــتن، تپــق نزده.

**نــەجیب:** *najib* ڕەســەن، ئاکــار چــاك. نجیب، اصیل، شریف.

**نــەجیب زادە:** *najibzâda* ڕەســەن، لــە بنەماڵەیەکی بە ئەسڵ و نەسەبدا. نجیب زاده.

**نـەجیم:** *najim* نـەجیب. نجیب، اصیل، شریف.

**نەچیر:** *načir* شکار، ڕاو. نخجیر، شکار، صید.

**نەچــــیرەوان:** *načirwân* شــــکارە وان، ڕاوکـەر. شکارچـی، کـسی کـە از راه شـکار امرار معاش می کند.

**نەحس:** *naĥs* شووم. نحس، بد یمن.

**نەحلـــەت:** *naĥlat* لەعنـــەت. لعنـــت، نفرین.

**نەحلــەتی:** *naĥlati* لەعنــەتی. لعــنتی، نفرین شده.

**نـەخت:** *naxt* دژی قـەرز. نقــد، مقابــل قرض.

**نەختە نەختـە:** *naxtanaxta* کەمەکـەم، کەم کەمە. کم کم، اندك اندك.

**نـــەختی:** *naxti* پێـــچەوانەی قـــەرزی. نقدی، به صورت نقد.

**نــەختێ:** *naxtē* هــا، نەختــێك. کمــی، اندکی، مقداری از چیزی.

**نەختێك:** *naxtēk* کەمێك. نگاه نەختی.

**نەختینە:** *naxtina* پارەوپووڵ. نقدینه.

**نـــــەخریاگ:** *naxeryâg* ڕانـــــەخراو، نەخراو، نەناردراو. انداخته نشده.

**نـــەخش:** *naxeš* ڕۆڵ، ڕەوڵ، نـــەخش. نقش، رُل، نگاره.

**نەخـــشانن:** *naxešânen* نەخـــشاندن. نقش کردن، رسم کردن، ترسیم کردن.

**نەخـشدار:** *naxešdâr* نەخـشین، خـاون نەخش. نقشدار، دارای نقش، منقوش.

**نـەخش و نمـا:** *naxešunmâ* نـەخش و ڕەنگدار. نقش و نگـار، نقـش نمـا، رنـگ و ریس.

**نەخشە:** *naxeša* ها، گەڵاڵە، ئـەوەی کـە ڕەسم کراوە. نقشه، تصویر رسم شــده از موقعیت جغرافیایی یــک مکــان، طــرح ریزی برای انجام یک کار، برنامــەریــزی پیش از اجرای عمل.

**نەخـشین:** *naxšin* نەخـشدار، جـوان و ڕەنگین. نقشدار، منقوش.

**نەخمـــە:** *naxma* ڕووتــرش، ڕووگــرژ. عبوس، ناشاد.

**نــەخوازا:** *naxwâzâ* ئـەوەی کـە داوای نەکراوە. نخواسته، طلب نکرده.

**نـــــەخوازەڵا:** *naxwâzaĭâ* خـــــودای نەخواســتە، تایبــەت. خـدای ناخواسـتە، ویژە.

**نەخوازیاگ**: *naxwâzyâg* نەخوازراو. نخواسته شده، خواسته نشده، نطلبیده.

**نەخوەرم**: *naxwarm* ئەوەی کەماڵی خۆی ناخوا، رژد. کنایه از خسیس که در عین تمکن مالی از امکانات خود به خوبی استفاده نمی‌کند.

**نەخۆریاگ**: *naxōŕyâg* نەخۆراو. خارانده نشده، خورده نشده.

**نەخوەش**: *naxwaš* ناساغ، ناخوش. بیمار، مریض، ناسالم.

**نەخوەشی**: *naxwaši* نەخۆشی، ناخۆشی، ناساغی. بیماری، مرض، عدم سلامت.

**نەخوەشین**: *naxwašin* ناخۆشین، ناساغی، نەخۆشین. بیماری، مرض.

**نەخوێنەوار**: *naxwēnawâr* بێ سەواد، نەخوێندەوار. بی سواد، درس نخوانده.

**نەخەنم**: *naxanem* رووتورش، رووگرژ. ناشاد، عبوس، اخمو، ترشروی.

**نەدار**: *nadâr* دەستتەنگ، دەستکورت، بێ سامان. ندار، بی چیز، فقیر.

**نەداری**: *nadâri* دەستتەنگی، دەستکورتی، بێ سامانی. نداری، بی‌چیزی، فقیری، فقر.

**نەدان**: *nadân* دژی دان. ندادن، امساك کردن.

**نەدرکانن**: *naderkânen* ئاشکرا نەکردن. آشکار نکردن.

**نەدرکیان**: *naderkeyân* نەهێنی مان، نەدرکاندن، نەدرکاندراو. مخفی ماندن.

**نەدیگ**: *nadig* نەدیو، نەبینراو، نەدیدە. ندیده، مشاهده نشده.

**نەدیە**: *nadiya* نەدیتە، نەدیدە، نەبینراو. ندیده، مشاهده نشده.

**نەڕ**: *naŕ* دژی مێ. نر، جفت ماده.

**نەڕان**: *naŕân* نێوی گوندێکە لە رۆژهەلاتی شاری سنە. نام روستایی در دامنه کوه سلطان سراج‌الدین در شرق شهر سنندج، نامی اوستایی که ریشه ی آن(نره)به معنی مرد محترم است.

**نەڕانن**: *naŕânen* نەڕاندن. غریدن، عربده‌کشیدن، نعره کشیدن.

**نەرد**: *nard* یاریی نەرد. تاوڵەکردن، تاوڵە. نرد، بازی نرد نگاه تەختە و نەرد.

**نەرگس**: *narges* گوڵی نێرگز. گل نرگس، گلی بسیار خوشبو به رنگهای سفید و زرد که در اوایل بهار می‌روید.

**نەرم**: *narem* دژی ڕەق، نۆڵ، شل. نرم، آهسته.

**نەرمایی**: *naremâi(i)* جێگای نەرم. جای نرم، نرمگاه.

**نەرمبوون**: *narembun* رازیبوون، لەڕەقی تەکینەوە. نرم شدن، کنایه از رضایت دادن.

**نەرمکردن**: *naremkerden* شلکردنەوە، رازیکردن. نرم کردن، راضی کردن.

**نەرمۆڵ**: *naremōĺ* زۆر نەرم، ئاماژەیە بۆ چکۆلەی دلگر. نگاه نەرموشل.

**نەرمۆڵـە:** *naremōĭa* بـچکۆلەی نـەرم. نرم، کنایه از کوچولوی چاق و چله.

**نەرم و شل:** *naremušel* زۆر نەرم، شل و مل، به حەوسەڵە. شل و نرم، انعطـاف پذیر.

**نەرمونۆڵ:** *naremunōĭ* زۆر نەرم، زۆر به حەوسەله و سـەبر. بـسیار نـرم، کنایـه از باوقار.

**نـەرم و نیـان:** *narmeuniyân* مرۆڤـی زۆر به سەبرحەوسەڵە و ئـارام. کنایــه از آدم با حوصله و صبور.

**نەرمە:** *narema* گۆشتی بێ ئیسقان. گوشت بدون استخوان.

**نەرمەبڕ:** *narmabeŕ* زمانباز. کنایه از آدم چرب زبان و موذی.

**نەرمـــە نەرمـــە:** *naremanarema* ئەسپایی، نـەرم نـەرم. نـرم نرمـك، انـدك اندك.

**نـــەرمی:** *naremi* دژی زبــری و رەقــی، هێواشـی. نرمـی، شـلی، آهـستگی، آرامـی، وقار، متانت.

**نەرمین:** *naremin* شل و نەرم. منـسوب به نرم، به معنای متین، باوقار، آرام.

**نەڕە:** *naŕa* نێڕە. صدای غرش.

**نـەزان:** *nazân* بـێ وەری لـە زانـین، بـێ خەبــەر، بــێ ئــاوەز. نـــادان، جاهـــل، بی‌اطلاع، ناآگاه.

**نـەزانکار:** *nazânkâr* هەڵـەکار. نـدانم کار، هرزه کار.

**نـــەزانکاری:** *nazânkâri* هەڵـــەکاری. ندانم کاری.

**نـەزانمکاری:** *nazânemkâri* هەڵـەکاری. ندانم کاری.

**نـەزانی:** *nazâni* نـادانی، نازانـایی، بـێ ئاوەزی. نادانی، بی خردی.

**نەزانین:** *nazânnin* نادانـی، پارچـە شیعرێــك لــە دکــتۆر ســعید خــان کوردستانی بەم نێوە. ندانستن، جهالـت، بی‌خبری، نام قطعه شعری به همین نـام از دکتر سعید خان کردستانی.

**نەزر:** *nazer* سەدەقە، بەخـشین مـاڵ بـۆ گەیشتن به حاجات. نذر، صدقه، بخشش.

**نەزم:** *nazem* تـەرز، رێکوپـێکی، هـەوای گۆرانی. نظم، ریتم، آهنگ.

**نەزمیــە:** *nazmiya* دایــرەی پــۆلیس. شهربانی قدیم، نظمیه.

**نـەزەر:** *nazar* ڕا، رای، بـڕوا، بۆچـوون. نظر، رای، عقیده.

**نەزێ:** *nazē* قـسر، نـەزۆك. نـازا، عقـیم، سترون.

**نـەژد:** *naždd* چـرچ، ناسـاف. چـــروک، ناصاف.

**نـــەژدی:** *naždi* چرچـــی، لۆچـــی. چروکیدگی، ناصافی.

**نەژنـــەفتن:** *nažnaften* نەبیـــستن. نشنیدن، خود را به کری زدن.

**نەژنـەوا:** *nažnawâ* کـەڕ، کەسـێك کـە گوێ کەڕ بێ. ناشنوا، حرف نشنو، کر.

**نەژنەوە:** *nažnawa* گوی نەبیس، گوێ نەگر. ناشنوا، حرف نشنو، کر.

**نەســاز:** *nasâz* دژی بــساز، وڕك گـــیر. بهانه جو، ناسازگار.

**نەسەرەفتن**: *nasaraften* نەسرەوتن. آرام نگرفتن.

**نەسەرەفیاگ**: *nasarafyâg* نەسرەوتە، وەقرە نەگرتوو. آرام نشدە.

**نەسرەو**: *nasraw* نەسرفتە، بێ قەرار. بی قرار، ناآرام.

**نەسرەوە**: *nasrawa* دژی سرەوتن. ناآرام، بی قرار.

**نەسرین**: *nasrin* نێوی گوڵێکە، نێوێکە بۆ ئافرەتان. گل نسرین، گلی سفید رنگ و خوشبو کە آنرا مشکین بوی یا مشکین گل هم گفتەاند، نامی برای زنان.

**نەسەنیاگ**: *nasanyâg* نەسنراو. خریداری نشدە.

**نەسیب**: *nasib* بەش، قسمەت، نەسیو. نصیب، قسمت، سهم، بهره.

**نەسێحەت**: *nasēĥat* ئامۆژگاری. نصیحت، پند، اندرز.

**نەسێو**: *nasēw* بەش، قسمەت. نصیب، قسمت، بهره.

**نەشکیاگ**: *našekyâg* نەشکاو، ساق. نشکسته، سالم.

**نەشمێریاگ**: *našmēryâg* نەژمێردراو. شمرده نشده.

**نەشۆر**: *našōr* ئاماژەیە بۆ ژنی عوزرنەشۆر. کنایه از زن یائسه، نشستنی.

**نەشە**: *naša* خواردنەوەی مەی یا خۆشییەك لە پاش کێشانی مادەی نەشەکەر پەیدا دەبێ، بە کەێف، خەمۆکی. نشئه، سرمستی، سُکر، مستی، سر خوشی از باده یا مواد مخدر.

**نەعلەت**: *na lat* نەحلەت، لەعنەت. لعنت، نفرین.

**نەعنا**: *na nâ* چەشنێك سەوزیی خواردن. نعنا، یکی از اقسام سبزی خوردنی کە بویی مطبوع دارد.

**نەفام**: *nafâm* بێ ئاوەز، دژی فام. نفهم، احمق، نابخرد.

**نەفامی**: *nafâmi* بێ ئاوەزی. نفهمی، نابخردی، نادانی.

**نەفامیاگ**: *nafâmyâg* نەفامراو. نفهمیده شده.

**نەفت**: *nafet* نەوت. نفت، مایعی قابل احتراق کە مصرف سوختی دارد.

**نەفتالین**: *nafetâlin* بۆ کوشتنی مێروو لە جلوبەرگی دەکەن. نفتالین، یکی از مواد شیمیایی کە برای از بین بردن حشرات موزی بە کار میرود.

**نەفتاوی**: *nafetawi* تێکەڵ بەنەوت. آغشته به نفت.

**نەفت فرۆش**: *nafetferōš* نەوت فرۆش. نفت فرۆش.

**نەفت کێش**: *nafetkēš* نەوت کێش. نفت کش.

**نەفتی**: *nafeti* نەوتی. نفتی، منسوب به نفت آغشته به نفت.

**نەفس**: *nafes* نەوس، گیان. نفس، جان، حقیقت هر چیز، نفس اماره یا نفس سلیم.

**نەفەس**: *nafas* هەناسە. نفس، دم، هوای کە از بینی و دهان وارد ریه میگردد.

